١٤٠٢ - ك

# نزیکترین دەرمانخانە !!

چەند تابلۆیەکی وون لە جیهانی بێ سنووری دوای گۆڕەدا







نووسینی

بەکر غەریب فەرەج

١٤٠٢ ـ ك



# نزیکترین دەرمانخانە !!

چەنـد تابلۆیەکی وون لە جیهانی بێ سنووری خوای گەورەدا

نووسینی

بەکر غەریب فەرەج

چاپخانەی «الحوادث»

بەغداد ـ ساڵی ١٩٨٢

بسم الله الرحمن الرحيم

بەناوی خوای گەورەو میهرەبانەوە

« ولدينا كتاب ينطق بالحق »

( صدق الله العظيم )

# پێشەکی

سوپای بۆ خوای گەورە بێت •

ڕەحمەتی خوای گەورە لەسەر گیانی پاکی پێغەمبەرمان‌و هەمــوو پێغەمبەران بێت •

ڕەحمەتی خوای گەورە لەسەر گیانی پاکی ئەو موسوڵمانانە بێت ، کە لە پێناوی پاراستنی ئەم ئایینە پاکەدا ( شەهید ) بوون •

ڕەحمەتی خوای گەورە لەسەر ئەم خوشك‌و برا موسوڵمانانە بێت، کە سنووری ئەم ئایینە پیرۆزە دەپارێزن لە ئیمپریالیستەکانی جیهـــان ، ( ان شاء الله ) سەربەرزیی هەردوو دونیایان هەیە ( آمین ) •

سوپاس بۆ خوای گەورە کە جارێکی تریش پێك گەیشتینەوە لــە جیهانی بێ سنووری قورئانی پیرۆزدا ، ( ان شاء الله ) هــەموو پیــت‌و ووشەیەکمان لە پێناوی ڕەزامەندی خوای گەورەیە ، ( ان شــاء اللــە ) ڕەزامەندی خوای گەورە سەرمایەی هەر دوو دونیامانە ( امین ، امین )•

خوشك‌و برا موسوڵمانەکانم :ـ قورئانی پیرۆز هەر لەو ڕۆژەی هاتۆتە خوارەوە ، وەکو کانیاوێکی شیرین پەخش دەبێت‌و پەخشان دەبێت بەسەر سینگی ئەم ئەستێرەیەدا ، هەر شارو دێیەکی کــە ئــەم شیرناوە ڕووی تێ بکات ئەوا ڕەگی برایەتی‌و دادپەروەری لەناو دڵی ئاوایەکەیاندا دەڕوێنێت •

•

ئەمە ڕاستی‌یەکە هەتا مێژوو نووسە بێباوەڕەکانیشــ نەیانتوانیــوە خۆی لێ لابدەن ! قورئانی پیرۆز ئەو دەریا بێ بنە بوو کە ئیمپراتۆریەتی زۆردارانی (ڕۆم‌و فارسی) قوت داو کێشوەری « ئەفریقیاو ئەوروپای » لە بەرەبەیانێکدا وەئاگا هێنا کە تیشکی زێرینی برایەتی‌و دادپەروەری لە ( غەرناتەو میسر ) دا تەم‌و مژی ستەمکارانی دەبێکا !

قورئانی پیرۆز ، هەر دەریا نەبوو ، بەڵکو ئەو کەنارە نەلەرزە بوو کە سەدان شەپۆلی ( هۆلاکۆو خاچ پەرستەکانی ) کردە بلقی ســەر دەریای مێژوو مێژووشی کردە مێژوو !

قورئانی پیرۆز ئەو قوتابخانەیە بوو ، ئەو مامۆستایە بــوو ، کــە لەهەر سەدەیەکدا ، بەسەدان پاڵەوانی گۆرەپانی دادپەروەری‌و زانیاری پێ گەیاند ٠

ئاینی ئیســلام ، توانی بە پەنجــە ناســکەکانی قورئــانی پیــرۆز گەورەترین ( عەمەلیات ) لە لاشەی ئابوری‌و کۆمەلایــەتی‌و رامیــاری جیهان بکات !

ئێمە کەزانیمان قورئانی پیرۆز خاوەنی ئــەم توانا لەبن نەهــاتوو وەیە ، ئێمە کە زانیمان قورئانی ئەو چەکە داهێنەرەیە ، دەبێ هــەردەم ئەم قورئانە پیرۆزە بکەینە تاکــە ڕێگا بۆ ڕەزامەندی خــوای گــەورە ، دەبێ ئەم قورئانە پیرۆزە بکەین بە پاپۆڕی بێ ترس‌و لە دەریای ژیاندا بێباکانە لە بەرانبەر شەپۆلی هەر لێ شێواواندا بوەستین ٠

ئەگەر سەیری مێژووی ڕووناکی موسوڵمانان بکەین لەوکاتــەی کە قورئانی پیرۆز تاکە چرای شانیان بــووە ، زۆر بەڕێکی گــەورەیی قورئانی پیرۆزمان بۆ ڕوون دەبێتەوە ، کە چۆن ، ئادەمیزاد دەخاتە باوەشی کامەرانی لە هەردوو دونیادا !

ئەو سەربەرزیو دادپەروەریەی کە دەستی لە ملی موسوڵمانانو ئادەمیزاد کردبوو لە سەدەی پێغەمبەر (ص) و خەلیفە نازدارەکان (د•خ) تاکو ئیمرۆ نەدیتراوەو چاوەڕوای ئەوەش مەبە جگە لە قورئانی پیرۆزو پرۆگرامی پێغەمبەر (ص) پرۆگرامێکیتر بتوانێت ئەم دادپەروەرییە دروست بکاتەوە ، بەڵێ ، ئادەمیزادی سەدەی بیستەم ، کە سەیری ژیانی ( بیلالو یاسرو موسعەبو عومەری کوری عەبدول عەزیزو •• وهتد ) دەکەن وەکو فلیمێکی کارتۆن یا کاریکاتێر دێتە بەو چاویان کە جێی تێڕامانو سەرنجی گەورەن !

قورئانی پیرۆز ، هەر سورەتێکی ئامێرێکی تایبەتیە ، کۆمپانیایەکی تایبەتییە ، هەر کۆمپانیایەکی جۆرە بەرهەمێکی نایاب دەخاتە بازاڕی ژیانی رۆژانەی ئادەمیزادەوە •

ئەو رۆژانەی کە ئەم کۆمپانیایانە لەسەر چۆك بوون ، ئەو رۆژانەی کە بەرهەمی ئامێرەکانی قورئانی پیرۆز بە بازاڕی ژیانی رۆژانەی ئادەمیزاددا بلاوبوەوە ، پاڵەوانی وا پێگەیشت لەم بازارەدا کە مێژوو بەسەر سورمانەوەو بە دوو دڵیەوە باسی داوێن پاکیو دادپەروەریو نەبەزیان دەکات !

ئەم پاڵەوانانە هەموو خۆشی دونیایان گۆڕیەوە بە خۆشی دواییو پاشە رۆژ ، بۆیە بوون بە سەربەرزی هەردوو دونیا ( ان شاء الله ) !

خوشكو برا موسوڵمانەکانم :ــ هەروو ئاواتێکمان لەم نامیلکەیەدا گەڕانەوەیە بۆ ئایینی پاکی بێگەدی ئیسلام ، گەرانەوەیە بۆ قورئانی پیرۆزو فەرموودەکانی (محمد) ی (ص) پێشەوامان ، گەڕانەوەیە بۆ ئەو دەرمانخانە نزیکەی کە لە سەدەی ( جاهیلی ) دا ( جاهیل بە هەموو واتای

ووشەکە ، جاهیل لە بارەی ئـابوریو رامیـاریو کۆمەلایەتیو خـووو رەووشت دا •• هتد ) ، ئەم ( ئەصحابانە ) دروست بکات •

کە تا دنیا دنیایـە ئـەم خاکە دەسـتو داوێن پاکی وا بەخۆیـەوە نابینێتو لە مێژوودا دووبارە نابێتەوە !

بەڵێ ، لە کاتێکدا پێك دەگەینەوە ، کە لەهەر چوار لادا گـەمارۆ دراوینو دەیانەوێت خاکەکەمان بکەنە بنکەی ئیمپریالیزمی جیهانیو بمان کەنە نۆکەری گوێ رایەڵ !

لە بنارێکدا ، گەیشـتینەیەك ، کە هـەوری چڵکنی مادیـەت بـە ئاسماندا ، هەڵدەگەرێتو بارانی بێدادیی بەسەرماندا دەبارێنێت •

ئەی کادیرانی قورئانی پیرۆز یەکبگـرن ، یەکبگرن لە پێنـاوی دروست کردنی جیهانێکی پڕ لە دادپەروەریو هوشیاری ، یەکبگرن بۆ رووخاندنی بیروباوەڕی پوچی مادیەتو وجودیەت ، با بەیەکەوە ببینە مامۆستای ئەم گەلەو خاکەکەمان بکەینە خوێندنگای ( محو الالحادیە ! )

نا ، نا ئەم گەلو ئەم خاکە جێگای بێباوەری تێدا نابێتەوە ، ئەوانەی کە بێباوەڕن ، با باش بزانن ، کە لە پشتی ئەم گەلو ئەم خاکە نین •

بەڵێ ، لەم نامیلکەیەدا ، چەند تابلۆیەکمان کردوە ، بە ( مطوع ) تاکوبن بە پاڵپشتی پۆلایینتان لە سپێری پاکی تێکۆ شانتاندا ، تاکو جارێکی تریش بۆ ئاوایی ئەم ئەستێرە قشتیلە رووبن بکەینەوە ، کە تۆڕی شـڕی مادیەتو رێکەوت پەرستی ناتوانێت چۆك نەدات بەرانبەر گەروی قورئانی پرۆزدا •

با پێنووسە ( موراهیقـەکانی ــ هەرزەکاریـەکان ) کـە لەســەر سنگی گۆڤارو رۆژنامەکانی زایۆنیزمو ماسۆنیەکان دەرشێنەوە ، زۆر

باش بزانن ، كە چینی بەرینی موسوڵمانان زۆر بە چاكی لەناو چاویاندا مۆری ناپاكیو نۆكەری ئیمپریالیزمی جیهانی بەدی دەكات .

خوشكو برا موسوڵمانەكانم :ــ دەسا بپاڕێنەوە لە خوای گەورە كە یارمەتیمان بدات‌و سەرمان بخات تاكو بە ماوەیەكی كــەم چەنــد تابلۆیەكی ترتان بۆ ئامادە بكەین هەر لە بارەی قورئانی پیرۆزدا .

**بەكر غەریب فەرەج**

مزگەوتی سەید غەریب ــ هەولێر

# پیشانگای یه‌كه‌م
«ئایه‌ته‌ پیته‌كان»

## پیشانگای یه‌كه‌م
### په‌رده‌ی یه‌كه‌م

ئه‌گه‌ر به‌ ووردی سه‌یری ئایه‌ته‌كانی دوای ئایه‌ته‌ پیته‌كان بكه‌ین چه‌ند لایه‌نێكی شاراوه‌مان بۆ روون ده‌بێته‌وه‌ له‌ قورئانی پیرۆزدا •

١ــ ئه‌گه‌ر سه‌یری ئایه‌ته‌كانی دوای ئه‌م ئایه‌ته‌ پیتانه‌ بكه‌ین ده‌بینین ووشه‌ی ( قورئانی پیرۆز ) تیایاندا هاتووه‌ :ــ

طه ★ ما انزلنا عليك القران لتشقى ــ طه •
ق ★ والقران المجيد ــ ق •
يس ★ والقران الحكيم ــ يس •
ص ★ والقران ذي الذكر ــ ص •

★ ★ ★

٢ــ ئه‌گه‌ر سه‌یری ئایه‌ته‌كانی دوای ئه‌م ئایه‌ته‌ پیتانه‌ بكه‌ین ده‌بینین ووشه‌ی ( أيات الكتاب ) تیایاندا هاتووه‌ ( واته‌ ئایه‌ته‌كانی قورئانی پیرۆز ) :ــ

المر ★ تلك أيات الكتاب ••• الرعد •
الم ★ تلك أيات الكتاب الحكيم ••• لقمان •

الـر ★ تلك أيات الكتاب المبين ... يوسف .

الـر ★ تلك أيات الكتاب ... يونس .

الـر ★ تلك أيات الكتاب وقران مبين ـ الحجر .

طسم ★ تلك أيات الكتاب المبين ... الشعراء .

طس ★ تلك أيات القران وكتاب مبين ـ النمل .

طسم ★ تلك أيات الكتاب المبين ـ القصص .

٣ـ ئەگەر سەیری ئایەتەكانی دوای ئـەم ئایەتە پیتانە بكـەین دەبینین ووشەی ( الكتاب ) تیایاندا هاتووە ، ( الكتاب = قورئانی پیرۆز):ـ

الم ★ ذلك الكتاب لا ريب فيه ـ البقرة .

الم ★ الله لا اله الا هو الحي القيوم ★ نزل عليك الكتاب بالحق ـ أل عمران ـ

المص ★ كتاب انزل اليك ـ الاعراف .

الـر ★ كتاب احكمت اياته ـ هود .

الـر ★ كتاب انزلناه ـ ابراهيم .

الم ★ تنزيل الكتاب لا ريب فيه ـ السجدة ـ

حم ★ تنزيل الكتاب من الله ـ المؤمن .

حم ★ تنزيل من الرحمن الرحيـم ★ كتاب فصلت اياته قرانا ـ السجدة ـ

حم ★ والكتاب المبين ـ الزخرف .

حم ★ والكتاب المبين ـ الدخان .

حم تنزيل الكتاب من الله ـ الجاثية .

حم ★ تنزيل الكتاب من الله ـ الاحقاف .

٤ـ ئەگەر سەیری ئایەتەکەی دوای ئەم ئایەتە پیتە بکەین دەبینین ووشەی ( الوحي ) تیایا هاتووە ( الوحي = چۆنیـەتی هاتنـە خـوارەوەی قورئانی پیرۆزە ) •

حم ★ عسق ★ كذلك يوحي اليك ـ الشورى •

لێرەدا بۆمان روون بۆوە کەوا ئایەتەکانی دوای ئایەتە پیتەکان زیاتر لە ( ٨٢٪ ) یان باسی قورئانی پیرۆزی تیایە ، وە هیچ ووشەو پیتێك لـەم قورئانە پیرۆزەدا بەبێ هۆ نەهاتۆتە خوارەوە ، کەواتە پەیوەندیـەکی زۆر زۆر پتەو لە نێوان قورئانی پیرۆزو ئایەتە پیتەکاندا هەیە ، بۆیە لە ئایەتەکانی دوای ئایەتە پیتەکاندا ووشەی ( القران ، أيات الكتاب ، الكتاب ، تنزيـل ، الوحي ) هاتووە •

هەر لەم ڕوانگەیەوە ، سەرەتای نامیلکەکەمان بە بەشی ئایەتە پیتەکان دەست پێ کرد ، تاکو بۆ ئاوایی سەدەی ئەتۆم ئاشکرای بکەین چۆن ئایەتە پیتەکان گەورەیی قورئانی پیرۆز دەنوێنن ، کەوا چۆن ئەم قورئانە پیرۆزە بە پیتو ووشەکانیەوە بەڵگەی گەورەییو مەزنی ئەو خوایە میهرەبانەیە ، بەڵگەی گەورەیی ئەم ئاینە گەورەیە کە رۆژ بە رۆژ لە گەشانەوە دایە •

× × ×

# پیشانگای یەکەم

## پەردەی دووەم

## ئایەتە پیتەکان بەر لە سەدەی چواردە هەمین‌دا *

خۆشك‌و برا موسوڵمانەکانم :ـ ئێستا لەم بەشەدا ، بەشی ئایەتـە پیتەکان ، باسی ئەو ئایەتە پیتانە دەکەین کە لە سەرەتای چەند سورەتێك‌دا هاتوون ، وە دەست درێژدەکەین بۆ ئەم جیهانە سەر سوڕهێنەرە کـە ئایەتە پیتەکان لە قورئانی پیرۆزدا دروستیان کردوە ٠

★ ★ ★

قورئانی پیرۆز لە (١١٤) سورەت پێـك هاتـووە ، سەرەتای (٢٩) سورەتیان بە ئایەتە پیت دەست پێ‌دەکەن ، ژمارەی ئایەتە پیتەکان (٣٠) ئایەتە پیتە لەم (٢٩) سورەتەدا ، ژمارەی ئەو پیتانەی کە ئەم (٣٠) ئایەتە پیتانەیان پێك هێناوە (١٤) پیتە :ـ

« أ ، ل ، م ، ص ، ر ، ك ، هـ ، ی ، ع ، س ، ح ، ط ، ق ، ن »

ئەم (١٤) پیتە (٧٨) جار دووبارە بۆتەوە تاکو ئەم (٣٠) ئایەتە پیتەیان پێك هێناوە ٠

---

★ نیاز (١٤) کۆچیە ٠

| ز | سوره‌ته‌کان | ئایه‌ته پیته‌کان |
|---|---|---|
| ١ | البقرة | أ ل م |
| ٢ | أل عمران | أ ل م |
| ٣ | الاعراف | أ ل م ص |
| ٤ | يونس | أ ل ر |
| ٥ | هـود | أ ل ر |
| ٦ | يوسف | أ ل ر |
| ٧ | الرعـد | أ ل م ر |
| ٨ | ابراهيم | أ ل ر |
| ٩ | الحجـر | أ ل ر |
| ١٠ | مريـم | ك هـ ى ع ص |
| ١١ | طـه | ط هـ |
| ١٢ | الشعراء | ط س م |
| ١٣ | النمـل | ط س |
| ١٤ | القصص | ط س م |
| ١٥ | العنكبوت | أ ل م |
| ١٦ | الروم | أ ل م |
| ١٧ | لقمـان | أ ل م |
| ١٨ | السجدة | أ ل م |
| ١٩ | يس | ى س |
| ٢٠ | ص | ص |
| ٢١ | غافـر | ح م |
| ٢٢ | فصلت | ح م |

| ٢٣ | الشوری | ح م |
|---|---|---|
| ٢٤ | الشوری | ع س ق |
| ٢٥ | الزخرف | ح م |
| ٢٦ | الدخان | ح م |
| ٢٧ | الجاثية | ح م |
| ٢٨ | الاحقاف | ح م |
| ٢٩ | ق | ق |
| ٣٠ | القلم | ن |
| (٢٩) سورەت | | (٧٨) پیت |

بەڵێ ئەم ئایەتە پیتانە تا ئیمرۆ لەلایەن زاناکانی بەر لە سەدەی (١٤ـك) گەلێك پێناسەو شیٚ کردنەوەیان بۆ ئەم مەبەستە داناوە ، هەر چەند لـە (٩٩٪)ی ئەم پێناسانەی کە بۆ ئەم ئایەتە پیتانـە کراوە لەسەر زەمینەیەکی رفۆكدا دانراوە ، بەلاّم لە خوای گەورە دەپاڕێمەوە کە پاداشتێکی چاکیان بداتەوە چونکە نیازیان لەم پێناسانە ـ ( ان شاء الله ) رەز امەندی خوای گەورە بووەو بەس •

★ ★ ★

بۆ ئەوەی کە کەمێك ئاگاداربینەوە لە بەرهەمی زاناکانی پێشوو ، لە رووی ئایەتە پیتەکان ، ئەم (١١) نموونەیان لە پێناسەکانیان بۆ دەخەینە بەرچاو •

★ ★ ★

١ ـ هەندێ لە زاناکان پیتەکانی ئەم ئایەتـە پیتانەیـان بە نـــاوی ( ئەصحابەکان ) داناوە ، بۆ نموونە دەڵێن :ـ

پیتی (هـ) واتاکەی ناوی ( ابی هو رەیرەیە ) •
پیتی (ن) واتاکەی ناوی ( عوسمانە ) •
پیتی (س) واتاکەی ناوی ( سەعدە ) (١) •
پیتەکانی ( أ ل م ر ) واتاکەی ناوی ( موغیرەیە ) •
پیتەکانی ( أ ل م ) واتەکەی ناوی ( زوبەیرە ) • (٢)

★ ★ ★

کۆمەلەیەکی‌تر دەڵێن :ـ پیتەکانی
( أ ل م ) واتاکەیان بەم شێوەیەیە :ـ
پیتی (أ) واتە ( الله ) •
پیتی (ل) واتە ( جوبرائیل ) (ص) •
پیتی ( م ) واتە ( موحەمەد ) (ص) • (٣)

★ ★ ★

٣ ـ هەندێ زانای تر دەڵێن :ـ پیتەکانی ( ی س ) واتە ناوی پێغەمبەرە ( موحەمەد ص ) • (٤)
پیتەکانی ( ط هـ ) واتە ناوی پێغەمبەرمانە ( موحەمەد ) (ص) •
پیتی (ق) ناوی چیایەکە ! (٥)

---

١ ـ ( حول فواتح بعض السور ) د• رمضان عبدالتواب •
٢ ـ ( مباحث في علوم القران ) ل ـ ٢٣٩ •
٣ ـ ( مجمع البيان ) ، بەرگی ـ ١ ، ل ـ ٣٢ •
٤ ـ بۆیە تائێستاش موسولمانان ناوی کورەکانیان دەنێن ( یاسین تەها ) چونکە مبەستیان ناوی پێغەمبەرە ! !
٥ ـ ( میزان ) ، طباطبائی ، بەرگی ـ ١٨ ، ل ـ١٤ •

یادەڵێن ، خانووی بەهەشت لەم پیتانە دروست دەکرێت !! (٦)

★ ★ ★

٤ ـ هەندێ زانای‌تر ئەم پیتانەی لەم ئایەتە پیتانەدا هەن بە نهێنی دەزانن کە ئەم نهێنیەش ( وەك دەڵێن ) تەنیا لە نێـوان خـوای گەورەو پێغەمبەرمانــە (٧) ، یاخود دەڵێن واتای ئەم پیتانە خوای گەورەو پێغەمبەرمان تێی دەگەن • ( ٨ ـ ٩ )

★ ★ ★

٥ ـ هەندێ زانای‌تر ئەم پیتانەیان بە نیشانەی سەرەتاو کۆتایـــــی سورەتەکان داناوە ، وەك بڵێی کە سورەتی ( الفاتحة ) کۆتایی هات پیتەکانی ـ أ ل م ـ دێت ، (١٠) واتە سورەتی ـ الفاتحة ـ کۆتایی هات‌و سورەتی ـ البقرة ـ دەستی پێ‌کرد ، وە کە سورەتی ـ البقرة ـ کۆتایی هات پیتەکانی ( أ ل م ) دێت ، واتــــە سورەتی ( أل عمران ) دەست پێ دەکات ••• هتد •

★ ★ ★

٦ ـ هەندێ زانای‌تر ئەم ئایەتە پیتانەیان بە سوێند داناوە ، کە خوای گەورە دەفەرموویت ، وەك :ـ

( أ ل م ★ ذلك الكتاب لا ريب فيه ) واتە ، ( سوێند بێـت ★ ( ذلك الكتاب لا ريب فيه ) •

---

٦ ـ ( من اسرار القران ) د• مصطفى محمود •

٧ ـ ( تفسير السمرقندي ) ، السمرقندي •

٨ ـ ( تفسير الاصفى ) •

٩ ـ ( روح البيان ) ، بەرگی ـ ١ ، ل ـ ٢٨ •

١٠ـ ( البيان ) زرقاني ، بەرگی ـ ١ ، ل ـ ٨٦ •

( طه ★ ما انزلنا عليك القران لتشقى ) واته ، ( سويند بێت )
★ ( ما انزلنا عليك القران لتشقى ) •(١١)

ئايەتە پیتەکانی تریش هەر بەم شێوەیە بە واتای ( سوێند ) هاتوون •

★ ★ ★

٧ ـ کۆمەڵێك زانای‌تر ، ئەم ئایەتە پیتانەیان بە واتای ووشەی (القران) (١٢) داناوە ، وەك بڵێی :ـ

( ك هـ ى ع ص ★ ذكر رحمت ربك ••• ) واتە ،
( القران ) ★ ( ذكر رحمت ربك ••• ) •
( أ ل م ★ ذلك الكتاب لاريب فيه ••• ) واتە ،
( القران ) ★ ( ذلك الكتاب لا ريب فيه ••• ) •

★ ★ ★

٨ ـ هەندێ زانای‌تر بیروڕایان وایە ، ئەم ئایەتە پیتانە ناوی سورەتەکانی قورئانی پیرۆزن ، وەك بڵێی :ـ

سورەتی ـ البقرة ـ ناوی سورەتی ـ أ ل م ـ • •
سورەتی ـ طـه ـ ناوی سورەتی ـ طه ـ يه ـ •
سورەتی ـ القلم ـ ناوی سورەتی ـ ن ـ ٥ ••• هتد (١٣) •

★ ★ ★

---

١١ـ ( مجمع البيان ) بەرگی ـ ١ ، ل ـ ٨٦ •
١٢ـ ( جامع البيان ) بەرگی ـ ١ ، ل ـ ٨٦ •
١٣ـ ئەگەر بتەوێ لە پێناسە لاوازەکانی کە بۆ ئایەتە پیتەکان کراوە بگەی، بروانە (الحروف المقطعة ـ عبدالجبار شرراره)، کە زۆر بە بە وردیو بە شێوەیەکی زانیاری یەك لە دوای یەك پێناسەکانی شیکردۆتەوەو نرخاندونی •

٩ ــ هەندێ زانا ئەم ئایەتە پیتانەیان بە (اسمي اعظم) داناوە ، واتە ناوە گەورەکانی خوای گەورەن بەلای ئەوانەوە (١٤) •

★ ★ ★

١٠ــ هەندێ زانای‌تر دەڵێن :ــ ئــەم پیتانــە پەیوەنــدیان لەگەڵ سوڕانەوەو یاسای نێوان ئەستێرەکاندا هەیە ، (١٥) هەندێکی‌تر دەڵێن ، گوایە ئەم پیتانە پەیوەندیان لەگەڵ تەمەنی ئایینی ئیسلامدا هەیە ، ئــەم پێناسەیەیش لەوەوە هاتووە ، کە عەرەبەکان هەر لە کۆنەوە بۆ هەرپیتێك ژمارەیەکیان داناوەو بەم خشتەیەش دەڵێن ــ حساب أبــی جــاد ــ ئەمەش خشتەکەیــە •

« خشــتە ــ أبي جــاد ــ »

أ ــ ١ ، ب ــ ٢ ، جـ ــ ٣ ، د ــ ٤ ،
هـ ــ ٥ ، و ــ ٦ ، ز ــ ٧ ، ح ــ ٨ ،
ط ــ ٩ ، ی ــ ١٠ ، ك ــ ٢٠ ، ل ــ ٣٠ ،
م ــ ٤٠ ، ن ــ ٥٠ ، س ــ ٦٠ ، ع ــ ٧٠ ،
ف ــ ٨٠ ، ص ــ ٩٠ ، ق ــ ١٠٠ ، ر ــ ٢٠٠ ،
ش ــ ٣٠٠ ، ت ــ ٤٠٠ ، ث ــ ٥٠٠ ، خ ــ ٦٠٠ ،
ذ ــ ٧٠٠ ، ض ــ ٨٠٠ ، ظ ــ ٩٠٠ ، غ ــ ١٠٠٠

بەپێی ئەم خشتەیە عەرەبەکان بۆهەر ووشەیەك یان ناوێك ، ژمارەیەکیان دادەنا ، بۆ بەلگەش بۆ تەمەنی پێغەمبەر (ص) دەیان گووت

---

١٤ــ ( الدر المنشور ) ، سیوطی ، بەرگی ــ ١ ، ل ــ ٢٢ •
١٥ــ ( نظرات الاستشراقية في الاسلام ) د• محمد غلاب ، ل ــ ٤٤ •

(سبج) واتە (٦٣)ساڵ ، چونکە پیتی (س) واتە ژمارە (٦٠) ، وە پیتی (ج) واتە ژمارە (٣) ، واتە ( ٦٠ + ٣ = ٦٣ ) ساڵ بوو تەمەنی پێغەمبەرمان (ص) کە وەفاتی کرد ، وە ووشەی (نج) یان بۆ تەمەنی پێغەمبەر (ص) داناوە کاتێ کە کۆچی کردوە لە ( مەکە )ی پیرۆزەوە بۆ ( مەدینە )ی پیرۆز ، چونکە پیتی (ن) ژمارەکەی (٥٠)یەو پیتی (ج) ژمارەکەی (٣)یە واتە تەمەنی پێغەمبەرمان (ص) کە کۆچی کرد ( ٥٠ + ٣ = ٥٣ ) ساڵ بوو .

بەم شێوەیە ، هەر لەم روانگەیەوە ، بێ باوەڕان ، سەیری ئایەتە پیتەکانیان دەکرد ، ئەوکاتەی کە جوولەکان ئایەتە پیتی ( أ ل م )یان بیست یەکسەر کردیانە گاڵتە پێ‌کردن‌و گوتیان ئەمە نیشانەی تەمەنـــی ئاینی ئیسلامە ، تەمەنی ئاینی ئیسلام تەنیا (٧١) ساڵە ، چونکە بەلای بێ باوەڕەکانەوە ، بەم شێوەیە ، ئایەتە پیتەکان پێناسە دەکرا :ـ

پیتی ( أ ) واتە ( ١ ) .
پیتی ( ل ) واتە ( ٣٠ ) .
پیتی ( م ) واتە ( ٤٠ ) .
کۆیەکەیان = ( ٧١ ) ساڵ !

★ ★ ★

بەڵام کە ، ئایەتە پیتی ( ك هـ ی ع ص ) یان بیست وتیان :ـ

پیتی (ك) واتە (٢٠) .
پیتی (هـ) واتە (٥) .
پیتی (ی) واتە (٩) .
پیتی (ع) واتە (٧٠) .
پیتی (ص) واتە (٩٠) .
کۆیەکەیان = (١٩٤) ساڵ :



واته (١٩٤) ساڵه تەمەنی ئاینی ئیسلامە ! ئیتر ئەم ئایەتە پیتانە بەپێی ئەم خشتەیە سەیر دەکرانو وەسەرجەمی ژمارەکان بە تەمەنی ئاینی ئیسلامدا دادەنرا (١٦) !

ئیتر بەناو بێ باوەڕەکاندا بلاویان دەکردەوە کە گوایە ئاینی ئیسلام تەمەنی (٧١) یا (١٩٤) یـا ••• یـا ••• هتد ، ساڵەو هیچی تر !

بەڵام لە ئەنجامدا ، هەموو ئاواتێکیان بوو بە خۆڵەمێشو بەنـاو بیابانی مێژوودا بلاو بۆوە ، قورئانی پیرۆزیش لە دوای زیاتر لە (١٤٠٠) ساڵ تازە خونچەو چرۆی نەمری دەردەکانو دەگەشێتەوە !



١١ـ کۆمەڵێك لە زانایانیتر دەڵێن ئەم ئایەتە پیتانە بۆ سەرنـج راکێشان هاتوون ، تاکە بەڵگەشیان بۆ ئەم قسەیە ئەوەیە :ـ

لەرێ لادەرو بێباوەڕان ، لەنێـوان خۆیاندا پەیمانیـان دابوو ، هەرکاتێ گوێیان لە خوێندنی قورئانی پیرۆز بوو دەست بکەن بە هاوار هاوارو گاڵتەکردن ، بەڵکو هیچ کەس گوێی لە قورئانی پیرۆز نەبێت، بۆیە قورئانی پیرۆز لەم بارەیـەوە دەفەرمـووێت ! وقال الذين كفـروا لا تسمعوا لهذا والغوا فيه لعلكم تغلبون ـ ٢٩ ـ فصلت ) •

ئەم زانایانە ، دەڵێن بۆیە ئەم ئایەتە پیتانە هاتوون ، تاکو بە هۆی ئەم ئایەتە پیتانەوە ، بێ باوەڕان گوێ لە ئایەتەکانیتر بگرن ، چونـکە ئەم کۆمەلە پیتەکە لە ووشە دەچنو لە ڕاستیشدا ووشەنین ، بێ باوەڕان ناچار دەکات ، کە گوێی لێ بگرنو بزانن چ واتایەکیان هەیە ، جـا بەهۆی ئەم ئایەتە پیتانەوە گوێ لە ئایەتەکانیتر بگرن ، کە لە دوایانـدا

---

١٦ـ ( الحروف المقطعة ) عبدالجبار شراره ، ل ـ ٢٢ •

دێت ، واتە ئەم ئایەتە پیتانە ( بەلای ئەم زانایانەوە ) بۆ سەرنج راکێشان هاتوون (١٧)



بەم شێوەیەی کە باسمان کرد ، بە گەلێك شێوەی تریش ئەم ئایەتە پیتانە پێناسە کراونو شیکراونەتەوە ، بەڵام زۆر باش بزانە ، کە تـا ئیمرۆش زانا موسوڵمانەکان نەیانتوانیوە بە تەواوی لە دڵو دەرونـــی ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز بگەنو پێناسەو شیکردنەوەیەکی پر بە پێستیان بۆ بکەن ، بە تایبەتی ئایەتە پیتەکان تـا ئیمرۆش بـە چاکی پێناسەیـان نەکراوە !

خەلیفەی یەکەممان ( ابو بەکری سەدیق ـ د• خ ) دەفەرمووێت ( هەموو کتێبێك نهێنیەکی خۆی هەیە ، نهێنی ئەم قورئانە پیرۆزەش ئایەتە پیتەکانیەتی ) !

بەڵێ ، ئەم چەند لاپەڕەیەی کە دیتت ، لە بارەی شیکردنەوەی زاناکانی بەر لە سەدەی چواردەهەم بوون ، ئێستاش بـەرەو ئـــەو کۆدەتایە گەورەیە دەچین کە ئایەتە پیتەکان گێڕایان لەم چارێکە سەدەیەدا ئەو کۆدەتایەی کە بۆ ئاوایی ئەم بوونەوەرەی ئاشکرا کرد کە خـوای گەورە دەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێکدا هەیە ، ئەو کـۆدەتایە پـەردەی لەسەر دەسەڵاتی بێ سنووری خـوای گـەورە لادا ، ( ان شاء الله) موسوڵمانان سودی لێ وەردەگرن •



---

١٧ـ أـ (الجامع لاحكام القران) قرطبي، بەرگی ـ ١ ـ ، ل ـ ١٥٥ •
ب ـ ( جامع البيان ) طبري ، بەرگی ـ ١ ، ل ـ ٨٩ •

# پیشانگای یەکەم

## پەردەی سێیەم

## « سنوری پیتی ئایەتە پیتەکان »

لەم پەردەیەدا سنووری هەر (٣٠) ئایەتە پیتەکان دەخەینە بەرچاو لە (٢٩) سورەتەکەدا .

★ ★ ★

١ ـ سورەتی (البقرة) ئایەتی یەکەمی ئایەتە پیتە ( أ ل م ) ، ئەم (٣) پیتە لەم سورەتەدا بەم شێوەیەی خوارەوە دووبارە بۆتــەوە بــۆ نموونە : ـ

پیتی (أ) لەم سورەتەدا (٤٥٩٢) جار هاتووە ، (٤٥٩١) جار لە هەموو ئایەتەکانی دوای ئایەتە پیتەکەدا هاتووە ، وە (١) جاریش لــە ئایەتــە پیتەکەدا هاتووە ، واتە (٤٥٩٢) جار پیتی (أ) لەم سورەتەدا هاتووە .

پیتی (ل) لەم سورەتەدا (٣٢٠٤) جار هاتووە ، (٣٢٠٣) جار لــە ئایەتەکانی دوای ئایەتە پیتەکەدا هاتووە وە (١) جاریش لە ئایەتە پیتەکەدا هاتووە ، واتە (٣٢٠٤) جار پیتی (ل) لەم سورەتەدا هاتووە .

پیتی (م) (٢١٩٥) جار هاتووە ، لەم سورەتەدا ، (٢١٩٤) جار لە

ئایەتەکانی دوایی ئایەتە پیتەکەدا هاتووە وە (١) جاریش لە ئایەتە پیتەکەدا هاتووە ، واتە (٢١٩٥) جار پیتی (م) لەم سورەتەدا هاتووە •

کەواتە ئەم (٣) پیتە لەم سورەتەدا بەم شێوەیەی خوارەوە دووبارە بۆتەوە : ـ

پیتی ( أ ) (٤٥٩٢) جار دووبارە بۆتەوە •
پیتی ( ل ) (٣٢٠٤) جار دووبارە بۆتەوە •
پیتی ( م ) (١٢٩٥) جار دووبارە بۆتەوە •

(٩٩٩١) جار ئەم پیتانە لە سورەتی ( البقرة )دا هاتووە •



٢ ـ سورەتی ( آل عمران ) ئایەتی یەکەمی ئایەتە پیتە ( أ ل م )، ئەم (٣) پیتە ( وەکو پیتەکانی ئایەتە پیتی سورەتی ـ البقرة ـ ) بەم شێوەیەی خوارەوە دووبارە بۆتەوە : ـ

پیتی ( أ ) (٢٥٧٧) جار هاتووە لە هەموو ئایەتەکانی دوای ئایەتە پیتەکەدا وە (١) جاریش لە ئایەتە پیتەکەدا هاتووە ، کەواتە پیتی ( أ ) (٢٥٧٨) جار لە سورەتەکەدا هاتووە •

پیتی (ل) (١٨٨٤) جار لە ئایەتەکانی دوای ئایەتە پیتەکەدا هاتووە وە (١) جاریش لە ئایەتە پیتەکەدا هاتووە ، کەواتە (١٨٨٥) جار پیتی (ل) لەم سورەتەدا هاتووە •

بەڵام پیتی (م) (١٢٥٠) جار لە ئایەتەکانی دوای ئایەتە پیتەکەدا هاتووە وە (١) جاریش لە ئایەتە پیتەکەدا هاتووە ، کەواتە پیتی ( م ) (١٢٥١) جار لەم سورەتەدا دووبارە بۆتەوە ، سەرجەمی ئەم (٣) پیتە لەم سورەتەدا بەم شێوەیەی خوارەوەیە :ـ

پیتی ( أ ) (٢٥٧٨) جار دووباره بۆتەوە •
پیتی ( ل ) (١٨٨٥) جار دووباره بۆتەوە •
پیتی ( م ) (١٢٥١) جار دووباره بۆتەوە •

(٥٧١٤) جار ئەم پیتانە لە سورەتی ( أل عمران )دا هاتوون •

★ ★ ★

٣ ـ سورەتی ( الاعراف ) یەکەم ئایەتی ئایەتە پیتەکانە ، ( أ ل م ص ) ، ئەم (٤) پیتەی لەم ئایەتە پیتەیە بەم شیۆەیەی خوارەوە لـەم سورەتەدا دووباره بۆتەوە :ـ

پیتی ( أ ) (٢٥٧٢) جار دووباره بۆتەوە •
پیتی ( ل ) (١٥٢٣) جار دووباره بۆتەوە •
پیتی ( م ) (١١٦٥) جار دووباره بۆتەوە •
پیتی ( ص ) (٩٨) جار دووباره بۆتەوە •

(٥٣٥٨) جار ئەم پیتانە لە سورەتی (الاعراف)دا هاتوون •

★ ★ ★

٤ ـ سورەتی (یونس) ئایەتی یەکەمی ئایەتە پیتە ( أ ل ر ) ئەم (٣) پیتەش بەم شیۆەیەی خوارەوە لەم سورەتەدا دووباره بۆتەوە :ـ

پیتی ( أ ) (١٣٥٣) جار دووباره بۆتەوە •
پیتی ( ل ) (٩١٢) جار دووباره بۆتەوە •
پیتی ( ر ) (٢٥٧) جار دووباره بۆتەوە •

(٢٥٢٢) جار ئەم پیتانە لە سورەتی (یونس)دا هاتوون •

★ ★ ★

٥ ـ سورتی ( هود ) ئایەتی یەکەمی ئایەتە پیتە ( أ ل ر ) ، ئەم (٣) پیتەی لەم ئایەتە پیتەیە بەم شیوەیەی خوارەوە دووبارە بۆتەوە :ـ

پیتی ( أ ) (١٤٠٢) جار دووبارە بۆتەوە .
پیتی ( ل ) (٧٨٨) جار دووبارە بۆتەوە .
پیتی ( ر ) (٣٢٤) جار دووبارە بۆتەوە .

(٢٥١٤) جار ئەم پیتانە لە سورەتی (هود)دا هاتوون .

★ ★ ★

٦ ـ سورەتی (یوسف) یەکەم ئایەتی ئایەتە پیتە ( أ ل ر ) ، ئەم (٣) پیتە بەم شیوەیەی خوارەوە لەم سورەتەدا دووبارە بۆتەوە :ـ

پیتی ( أ ) (١٣٣٥) جار دووبارە بۆتەوە .
پیتی ( ل ) (٨١٢) جار دووبارە بۆتەوە .
پیتی ( ر ) (٢٥٨) جار دووبارە بۆتەوە .

(٢٤٠٥) جار ئەم پیتانە لە سورەتی (یوسف)دا هاتوون .

★ ★ ★

٧ ـ سورەتی (الرعد) یەکەم ئایەتی ئایەتە پیتە ( أ ل م ر ) ، ئەم (٤) پیتە لەم سورەتەدا بە شیوەیەی خوارەوە دووبارە بۆتەوە :ـ

پیتی ( أ ) (٦٢٥) جار دووبارە بۆتەوە .
پیتی ( ل ) (٤٧٩) جار دووبارە بۆتەوە .
پیتی ( م ) (٢٦٠) جار دووبارە بۆتەوە .
پیتی ( ر ) (١٣٧) جار دووبارە بۆتەوە .

(١٥٠١) جار ئەم پیتانە لە سورەتی (الرعد)دا هاتوون .

★ ★ ★

٨ ـ سورەتی ( ابراهیم ) یەکەم ئایەتی ئایەتە پیتە ( أ ل ر ) ، ئەم (٣) پیتەش بەم شێوەیەی خوارەوە دووبارە بۆتەوە لەم سورەتەدا :ـ

پیتی ( أ ) (٥٩٤) جار دووبارە بۆتەوە •
پیتی ( ل ) (٤٥٢) جار دووبارە بۆتەوە •
پیتی ( ر ) (١٦٠) جار دووبارە بۆتەوە •

(١٢٠٦) جار ئەم پیتانە لە سورەتی ( ابراهیم )دا هاتوون •

★ ★ ★

٩ ـ سورەتی (الحجر) یەکەم ئایەتی ئایەتە پیتە ، ( أ ل ر ) ، ئەم (٣) پیتە بەم شێوەیەی خوارەوە لەم سورەتەدا دووبارە بۆتەوە :ـ

پیتی ( أ ) (٥٠٣) جار دووبارە بۆتەوە •
پیتی ( ل ) (٣٢٣) جار دووبارە بۆتەوە •
پیتی ( ر ) (٩٩) جار دووبارە بۆتەوە •

(٩٢٥) جار ئەم پیتانە لە سورەتی (الحجر)دا هاتوون •

★ ★ ★

١٠ـ سورەتی (مریم) یەکەم ئایەتی ئایەتە پیتە (ك ه ی ع ص)، ئەم (٥) پیتە لەم سورەتەدا بەم شێوەیەی : خوارەوە دووبارە بۆتەوە :ـ

پیتی ( ك ) (١٣٧) جار دووبارە بۆتەوە •
پیتی ( ه ) (١٦٨) جار دووبارە بۆتەوە •
پیتی ( ی ) (٣٤٥) جار دووبارە بۆتەوە •
پیتی ( ع ) (١٢٢) جار دووبارە بۆتەوە •
پیتی ( ص ) (٢٦) جار دووبارە بۆتەوە •

(٧٩٨) جار ئەم پیتانە لە سورەتی (مریم)دا هاتوون •

× × ×

١١ـ سورەتی (طه) یەکەم ئایەتی ئایەتە پیتە ( ط هـ ) ، ئەم (٢) پیتە لەم سورەتەدا بەم شێوەیەی خوارەوە دووبارە بۆتەوە :ــ

پیتی ( ط ) (٢٨) جار دووبارە بۆتەوە •

پیتی ( هـ ) (٣١٤) جار دووبارە بۆتەوە •

(٣٤٢) جار ئەم پیتانە لە سورەتی (طه)دا هاتوون •

★ ★ ★

١٢ـ سورەتی (الشعراء) یەکەم ئایەتی ئایەتە پیتە ( ط س م ) ، ئەم (٣) پیتەش بەم شێوەیەی خوارەوە لەم سورەتەدا دووبارە بۆتەوە :ــ

پیتی ( ط ) (٣٣) جار دووبارە بۆتەوە •

پیتی ( س ) (٩٣) جار دووبارە بۆتەوە •

پیتی ( م ) (٤٨٩) جار دووبارە بۆتەوە •

(٦١٥) جار ئەم پیتانە لە سورەتی (الشعراء)دا هاتوون •

★ ★ ★

١٣ـ سورەتی (النمل) یەکەم ئایەتی ئایەتە پیتە ( ط س ) ، ئەم پیتە بەم شێوەیە دووبارە بۆتەوە :ــ

پیتی ( ط ) (٢٧) جار دووبارە بۆتەوە •

پیتی ( س ) (٩٣) جار دووبارە بۆتەوە •

(١٢٠) جار ئەم پیتانە لە سورەتی ( النمل ) دا هاتوون •

★ ★ ★

١٤ـ سورەتی (القصص) یەکەم ئایەتی ئایەتە پیتە ( ط س م ) ، ئەم (٣) پیتە لەم سورەتەدا بەم شێوەیەی خوارەوە دووبارە بۆتەوە :ــ

پیتی ( ط ) (١٩) جار دووباره بۆتەوە •
پیتی ( س ) (١٠٠) جار دووباره بۆتەوە •
پیتی ( م ) (٤٦١) جار دووباره بۆتەوە •

(٥٨٠) جار ئەم پیتانە لە سورەتی (القصص)دا هاتوون •

★ ★ ★

١٥- سورەتی ( العنكبوت ) یەکەم ئایەتی ئایەتە پیتە ( أ ل م ) ، ئەم (٣) پیتە (وەکو پیتەکانی ئایەتە پیتەکانیتر) بەم شێوەیەی خوارەوە بۆتەوە : -

پیتی ( أ ) (٧٨٤) جار دووباره بۆتەوە •
پیتی ( ل ) (٥٥٣) جار دووباره بۆتەوە •
پیتی ( م ) (٣٤٧) جار دووباره بۆتەوە •

(١٦٨٥) جار ئەم پیتانە لە سورەتی (العنكبووت)دا هاتوون •

★ ★ ★

١٦- سورەتی (الروم) یەکەم ئایەتی ئایەتە پیتە ( أ ل م ) ، ئەم (٣) پیتە بەم شێوەیەی خوارەوە لەم سورەتەدا دووباره بۆتەوە :-

پیتی ( أ ) (٥٤٥) جار دووباره بۆتەوە •
پیتی ( ل ) (٣٩٦) جار دووباره بۆتەوە •
پیتی ( م ) (٣١٨) جار دووبازە بۆتەوە •

(١٢٥٩) جار ئەم پیتانە لە سورەتی ( الروم ) دا هاتوون •

★ ★ ★

١٧- سورەتی (لقمان) یەکەم ئایەتی ئایەتە پیتە ( أ ل م ) ، ئەم (٣) پیتە لەم سورەتەدا بەم شێوەیەی خوارەوە دووباره بۆتەوە :-

پیتی ( أ ) (٣٤٨) جار دووباره بۆتەوە •

پیتی ( ل ) (٢٩٨) جار دووباره بۆتەوە •
پیتی ( م ) (١٧٧) جار دووباره بۆتەوە •

(٨٢٣) جار ئەم پیتانە لە سورەتی (لقمان)دا هاتوون •

★ ★ ★

١٨- سورەتی (السجدة) یەکەم ئایەتی ئایەتە پیتـە ( أ ل م ) ، ئەم (٣) پیتە لەم سورەتەدا بەم شێوەیەی خوارەوە دووباره بۆتـەوە :ـ

پیتی ( أ ) (٢٦٨) جار دووباره بۆتەوە •
پیتی ( ل ) (١٥٤) جار دووباره بۆتەوە •
پیتی ( م ) (١٥٨) جار دووباره بۆتەوە •

(٥٨٠] جار ئەم پیتانە لە سورەتی (السجدة) دا هاتوون •

★ ★ ★

١٩- سورەتی (یس) یەکەم ئایەتی ئایەتە پیتە (ی س) ، ئەم (٢) پیتە لەم سورەتەدا بەم شێوەیەی خوارەوە دووباره بۆتەوە :ـ

پیتی ( ی ) (٢٣٧) جار دووباره بۆتەوە •
پیتی ( س ) (٤٨) جار دووباره بۆتەوە •

(٢٨٥) جار ئەم پیتانە لە سورەتی (یس) دا هاتوون •

★ ★ ★

٢٠- سورەتی (ص) یەکەم ئایەتی ئایەتە پیتە (ص) ، ئەم پیتە لەم سورەتەدا (٢٧) جار لە ئایەتەکانی دوای ئایەتە پیتەکەدا هاتووە ، وە (١) جار لە ئایەتە پیتەکەدا هاتـووە ، واتە ئەم پیتـە (٢٨) جار لە سـورەتی (ص) دا هاتووە •

★ ★ ★

٢١ـ سورەتی (غافر) یەکەم ئایەتی ئایەتە پیتە ( ح م ) ، ئەم (٢) پیتە بەم شێوەیە دووبارە بۆ تەوە :ـ

پیتی ( ح ) (٦٤) جار دووبارە بۆتەوە •
پیتی ( م ) (٣٨٩) جار دووبارە بۆتەوە •

(٤٥٣) جار ئەم پیتانە لە سورەتی (غافر) دا هاتوون •

★ ★ ★

٢٢ـ سورەتی (فصلت) یەکەم ئایەتی ئایەتە پیتە (ح م) ، ئەم (٢) پیتە لەم سورەتەدا بەم شێوەیەی خوارەوە دووبارە بۆتەوە :ـ

پیتی ( ح ) (٥٨) جار دووبارە بۆتەوە •
پیتی ( م ) (٢٧٦) جار دووبارە بۆتەوە •

(٣٣٤) جار ئەم پیتانە لە سورەتی (فصلت) دا هاتوون •

★ ★ ★

٢٣ـ سورەتی (الشوری) یەکەم ئایەتی ئایەتە پیتە (ح م) ، ئەم (٢) پیپە لەم سورەتەدا بەم شێوەیەی خوارەوە دووبارە بۆتەوە :ـ

پیتی ( ح ) (٥٣) جار دووبارە بۆتەوە •
پیتی ( م ) (٣٠٨) جار دووبارە بۆتەوە •

(٣٦١) جار ئەم پیتانە لە سورەتی (الشوری) دا هاتوون •

★ ★ ★

٢٤ـ سورەتی (الشوری) دووەم ئایەتیشی ئایەتە پیتە (ع س ق) ، ئەم (٣) پیتە لەم سورەتەدا بەم شێوەیەی خوارەوە دووبارە بۆتەوە :ـ

پیتی ( ع ) (٩٩) جار دووبارە بۆتەوە •
پیتی ( س ) (٥٣) جار دووبارە بۆتەوە •

پیتی ( ق ) (٥٧) جار دووباره بۆتەوە •

(٢٠٩) جار ئەم پیتانە لە سورەتی ( الشوری ) دا هاتوون •

| | | |
|---|---|---|
| کەوانە سورەتی ( الشوری ) | ئایەتی (١) | پیتی (ح) = ٥٣ |
| | | پیتی (م) = ٣٠٨ |
| | ئایەتی (٢) | پیتی (ع) = ٩٩ |
| | | پیتی (س) = ٥٣ |
| | | پیتی ق = ٥٧ |
| | | ٥٧٠ |

بەڵێ ئەم (٥) پیتە لەم سورەتەدا (٥٧٠) جار دووبارە بۆتەوە •

★ ★ ★

٢٥- سورەتی (الزخرف) یەکەم ئایەتی ئایەتە پیتە (ح م) ، ئەم (٢) پیتە بەم شێوەیەی خوارەوە لەم سورەتەدا دووبارە بۆتەوە :-

پیتی ( ح ) (٤٥) جار دووبارە بۆتەوە •

پیتی ( م ) (٣١٧) جار دووبارە بۆتەوە •

(٣٦٢) جار ئەم پیتانە لە سورەتی ( الزخرف )دا هاتوون •

★ ★ ★

٢٦- سورەتی ( الدخان ) یەکەم ئایەتی ئایەتـە پیتـە ( ح م ) ، ئەم (٢) پیتە لەم سورەتەدا بەم شێوەیەی خوارەوە دووبارە بۆتەوە :-

پیتی ( ح ) (١٦) جار دووبارە بۆتەوە •

پیتی ( م ) (١٤٥) جار دووبارە بۆتەوە •

(١٦١) جار ئەم پیتانە لە سورەتی (الدخان)دا هاتوون •

★ ★ ★

٢٧ـ سورەتی ( الجاثية ) یەکەم ئایەتی ئایەتە پیتە ( ح م ) ، ئەم (٢) پیتە لەم سورەتەدا بەم شێوەیەی خوارەوە دووبارە بۆتەوە :ـ

پیتی ( ح ) (٣١) جار دووبارە بۆتەوە •
پیتی ( م ) (٢٠٠) جار دووبارە بۆتەوە •

(٢٣١) جار ئەم پیتانە لە سورەتی (الجاثية )دا هاتوون •

★ ★ ★

٢٨ـ سورەتی (الاحقاف) یەکەم ئایەتی ئایەتە پیتە ( ح م ) ، ئەم (٢) پیتە لەم سورەتەدا بەم شێوەیەی خوارەوە دووبارە بۆتەوە :ـ

پیتی ( ح ) (٣٧) جار دووبارە بۆتەوە •
پیتی ( م ) (٢٢٧) جار دووبارە بۆتەوە •

(٢٦٤) جار ئەم پیتانە لە سورەتی (الاحقاف)دا هاتوون •

★ ★ ★

٢٩ـ سورەتی (ق) یەکەم ئایەتی ئایەتە پیتە (ق) ، ئەم پیتە لـەم سورەتەدا (٥٧) جار دووبارە بۆتەوە •

★ ★ ★

٣٠ـ سورەتی (القلم) یەکەم ئایەتی ئایەتە پیتە ، پیتی (ن) ئایەتە پیتی سورەتی (القلم) ە ، ئەم پیتە لەم سورەتەدا (١٣٣) جار دووبـارە بۆتەوە •

★ ★ ★

لێرەدا کۆتاییمان بە دەست نیشان کردنی سنوری پیتەکانی هـەر (٣٠) ئایەتە پیت هێنا •

★ ★ ★

# پیشانگای یەکەم

## پەردەی چوارەم

## « سەرجەمی پیتەکانی ئایەتە پیتەکان »

لەم پەردەیەدا سنووری هەر (١٤) پیت دەخەینە بەر چاو لەهەر(٢٩) سورەتەکەدا ، بەو نیازەی کە لە پێناوی رەزامەندی خوای گـەورە بێتو موسوڵمانیش زیاتر سودی لیّوەربگرن •

١ - پیتی (أ) ، ئەم پیتە لە (١٣) ئایەتە پیتدا بەشداری کردوە ، واتە لە ئایەتە پیتی (١٣) سورەتدا هاتووە ، سەرجەمی ئـەم پیتە لـەم (١٣) سورەتەدا بەم شێوەیەیە :ـ

| ز | سورەتەکان | ژمـارەی دووبارە بوونەوەی پیتی (أ) تیایاندا |
|---|---|---|
| ١ | البقرة | ٤٥٩٢ |
| ٢ | ال عمران | ٢٥٧٨ |
| ٣ | الاعراف | ٢٥٧٢ |
| ٤ | یونس | ١٣٥٣ |
| ٥ | هــود | ١٤٠٢ |
| ٦ | یوسف | ١٣٣٥ |

| ٧ | الرعد | ٦٢٥ |
|---|---|---|
| ٨ | ابراهيم | ٥٩٤ |
| ٩ | الحجر | ٥٠٤ |
| ١٠ | العنكبوت | ٧٨٤ |
| ١١ | الروم | ٥٤٥ |
| ١٢ | لقمان | ٣٤٨ |
| ١٣ | السجدة | ٢٦٨ |
| | | ١٧٤٩٩ |

واته پیتی (أ) له هەر (١٣) سورتەکەدا (١٧٤٩٩) جار هاتووه •

★ ★ ★

٢ ـ پیتی (ل) ، ئەم پیتە ( وەکو پیتی (أ)ی هاوەڵەکەی ) له (١٣) ئایەتە پیتدا هاتووه ، وه سەرجەمەکەشی لە هەر (١٣) سورەتدا کە پیتی (ل) لە ئایەتە پیتیانە بەم شێوەیەیە :ـ

| ز | سورەتەکان | ژمارەی دووبارە بوونەوەی پیتی (ل) تیایاندا |
|---|---|---|
| ١ | البقرة | ٣٢٠٤ |
| ٢ | ال عمران | ١٨٨٥ |
| ٣ | الاعراف | ١٥٢٣ |
| ٤ | يونس | ٩١٢ |
| ٥ | هـــود | ٧٨٨ |
| ٦ | يوسف | ٨١٢ |
| ٧ | الرعد | ٤٧٩ |

| ٨ | ابراهیم | ٤٥٢ |
|---|---|---|
| ٩ | الحجر | ٣٢٣ |
| ١٠ | العنكبوت | ٥٥٤ |
| ١١ | الروم | ٣٩٦ |
| ١٢ | لقمان | ٢٩٨ |
| ١٣ | السجدة | ١٥٤ |
| | | ١١٧٨٠ |

واته پیتی (ل) له هەر (١٣) سورەتەكەدا (١١٧٨٠) جار هاتووه •

★ ★ ★

٣ ـ پیتی (م) ، ئەم پیتە لەناو پیتەكانی كە ئایەتە پیتەكانیان لـێ پێك هاتووه له هەموو پیتەكان زیاتر بەشداری كردووه •

پیتی (م) له (١٧) ئایەتە پیتدا هاتووه ، واته له ئایەتە پیتی (١٧) سورەتدا هاتووه ، وه سەرجەمەكەشی له هەر (١٧) سورەتەكەدا بەم شیۆەیەی خوارەوەیە :ـ

| ز | سورەتەكان | ژمارەی دووبارە بوونەوەی پیتی (م) تیایاندا |
|---|---|---|
| ١ | البقرة | ٢١٩٥ |
| ٢ | ال عمران | ١٢٥١ |
| ٣ | الاعراف | ١١٦٥ |
| ٤ | الرعد | ٢٦٠ |
| ٥ | الشعراء | ٤٨٩ |

| ٥ | القصص | ٤٦١ |
|---|---|---|
| ٧ | العنكبوت | ٣٤٧ |
| ٨ | الروم | ٣١٨ |
| ٩ | لقمان | ١٧٧ |
| ١٠ | السجدة | ١٥٨ |
| ١١ | غافر | ٣٨٩ |
| ١٢ | فصلت | ٢٧٦ |
| ١٣ | الشورى | ٣٠٨ |
| ١٤ | الزخرف | ٣١٧ |
| ١٥ | الدخان | ١٤٥ |
| ١٦ | الجاثية | ٢٠٠ |
| ١٧ | الاحقاف | ٢٢٧ |
| | | ٨٦٨٣ |

واتە پیتی (م) لەهەر (١٧) سورەتەکەدا (٨٦٨٣) جار هاتووە •

★ ★ ★

٤ ـ پیتی (ر) ئەم پیتە لەهەر (٣٠) ئایەتە پیتەکاندا تەنیا لـە (٦) ئایەتە پیتدا هاتووە ، وە هەر (٦) جاریش لە دوای یەکتردا هاتوون ، وە سەرجەمەکەشی لەم (٦) سورەتەی کە پیتی (ر) لە ئایەتە پیتیانە بـەم شێوەیەیە : ـ

| ز | سورەتەکان | ژمارەی دووبارە بوونەوەی پیتی (ر) تیایاندا |
|---|---|---|
| ١ | یونس | ٢٥٧ |
| ٢ | هــود | ٣٢٤ |
| ٣ | یوسف | ٢٥٨ |
| ٤ | الرعد | ١٣٧ |
| ٥ | ابراهیم | ١٦٠ |
| ٦ | الحجر | ٩٩ |
| | | ١٢٣٥ |

واتە پیتی ( ر ) لە هەر (٦) سورەتەکەدا (١٢٣٥) جار هاتووە •

★ ★ ★

٥ـ پیتی (ص) ، ئەم پیتە لەم (٢٩) سورەتەدا کە ئایەتە پیتیان هەیە تەنیا لە (٣) ئایەتە پیتدا هاتووە ، وە سەرجەمەکەشی بەم شێوەیەیە :ـ

| ز | سورەتەکان | ژمارەی دووبارە بوونەوەی پیتی (ص) تیایاندا |
|---|---|---|
| ١ | الاعراف | ٩٨ |
| ٢ | مریم | ٢٦ |
| ٣ | ص | ٢٨ |
| | | ١٥٢ |

واتە پیتی (ص) لەهەر (٣) سورەتەکەدا (١٥٢) جار هاتووە •

★ ★ ★

٦ - پیتی (ح) ، پیتی (ح) لە (٧) ئایەتە پیتدا هاتووە ، وە هەر (٧) جاریش لە دوای یەکتردا هاتووە ، وە سەرجەمەکەشی لەم (٧) سورەتەدا بەم شێوەیەی خوارەوەیە :ـ

| ز | سورەتەکان | ژمارەی دووبارە بوونەوەی پیتی (ح) تیایاندا |
|---|---|---|
| ١ | غافر | ٦٤ |
| ٢ | فصلت | ٥٨ |
| ٣ | الشوری | ٥٣ |
| ٤ | الزخرف | ٤٥ |
| ٥ | الدخان | ١٦ |
| ٦ | الجاثية | ٣١ |
| ٧ | الاحقاف | ٣٧ |
| | | ٣٠٤ |

واتە پیتی (ح) لە هەر (٧) سەرەتەکەدا (٣٠٤) جار هاتووە .

٧ـ پیتی (ط)، ئەم پیتە لە (٤) ئایەتە پیتدا هاتووە (٤) سورەت لەو سورەتانەی کە ئایەتـە پیتیان هەیـە ، وە سـەرجەمەکەشـی لەهەر (٤) سورەتەکەدا بەم شێوەیەی خوارەوەیە :ـ

| ز | سورەتەکان | ژمارەی دووبارە بوونەوەی پیتی (ط) تیایاندا |
|---|---|---|
| ١ | طـــه | ٢٨ |
| ٢ | الشعراء | ٣٣ |
| ٣ | النمـل | ٢٧ |
| | | ١٠٧ |

واتە پیتی (ط) لە هەر (٤) سورەتەکەدا (١٠٧) جار هاتووە •

★ ★ ★

٨ – پیتی (س) ، ئەم پیتە لەناو هەر (٣٠) ئایەتە پیتەکەدا تەنیا لە (٥) ئایەتدا بەشداری کردوە سەرجەمی ئەم پیتە لەم (٥) سورەتەدا کە ئایەتە پیتەکانیان پیتی (س) تیایە بەم شێوەیەی خوارەوەیە :–

| ز | سورەتەکان | ژمـارەی دوبارە بوونەوەی پیتی (س) تیایاندا |
|---|---|---|
| ١ | الشعراء | ٩٣ |
| ٢ | النمـل | ٩٣ |
| ٣ | القصص | ١٠٠ |
| ٤ | يس | ٤٨ |
| ٥ | الشورى (٢) | ٥٣ |
| | | ٣٨٧ |

واتە پیتی (س) لەهەر (٥) سورەتەکەدا (٣٨٧) جار هاتووە •

★ ★ ★

٩ ـ پیتی (هـ) ، ئەم پیتە لە (٢) ئایەتە پیتدا بەشداری کردوە ، وە سەرجەمی ئەم پیتە لەم (٢) سورەتەی پیتی (هـ) لە ئایەتە پیتیانـە بەم شیوەیەیە :ـ

پیتی ( هـ ) (١٦٨) جار لە سورەتی (مریم) دا هاتووە •

پیتی (هـ) (٣١٤) جار لە سورەتی (طـه)دا هاتووە •
سەرجەمەکەشی (٤٨٢) پیتە •

وانە پیتی (هـ) (٤٨٢) جار لەم (٢) سورەتەدا هاتووە •

★ ★ ★

١٠ـ پیتی (ق) ، ئەم پیتە تەنیا لە (٢) ئایەتە پیتدا هاتووە ، وە سەرجەمەکەشی بەم شیوەیەی خوارەوەیە : ـ

پیتی (ق) (٥٧) جار لە سورەتی (الشوری)دا هاتووە •
پیتی (ق) (٥٧) جار لە سورەتی (ق)دا هاتووە •
سەرجەمەکەشی (١١٤) پیتە •

واتە (١١٤) جار پیتی (ق) لەم (٢) سورەتەدا هاتووە •

★ ★ ★

١١ـ پیتی (ی) ، ئەم پیتەش تەنیا لە (٢) ئایەتە پیتدا بەشداری کردوە ، وە سەرجەمەکەشی لەم (٢) سورەتەی کە لە ئایەتە پیتەکانیاندا پیتی (ی) هاتووە بەم شیوەیەیە : ـ

پیتی (ی) (٣٤٥) جار لە سورەتی (مریم) دا هاتووە •
پیتی (ی) (٢٣٧) جار لە سورەتی ( یس ) دا هاتووە •

سەرجەمەکەشی (٥٨٢) پیتە •

واتە (٥٨٢) جار پیتی (ی) لەم (٢) سورەتەدا هاتووە •

★ ★ ★

١٢- پیتی (ع) ، ئەم پیتەش تەنیا لە (٢) ئایەتە پیتدا هاتووە ، واتە لە (٢) سورەت لەو سورەتانەی کە ئایەتە پیتیان هەیەو پیتی (ع) لـە ئایەتـە پیتەکەیانـە ، وە سـەرجەمی ئەم پیتـەش بـەم شێوەیـەی خوارەوەیە : ـ

پیتی (ع) (١٢٢) جار لە سورەتی (مریم) دا هاتووە •
پیتی (ع) (٩٩) جار لە سورەتی ( الشورى ) دا هاتووە •

سەرجەمەکەشی (٢٢١) پیتە •

واتە (٢٢١) جار پیتی (ع) لەم (٢) سورەتەدا هاتووە •

★ ★ ★

١٣- پیتی (ك) ، ئەم پیتە تەنیا لە ئایەتـە پیتی سـورەتی (مریم)دا هاتووەو سەرجەمەکەشی لە سورەتی (مریم)دا (١٣٧) پیتە ، واتە پیتی (ك) (١٣٧) جار لە سورەتی (مریم) دا هاتووە •

★ ★ ★

١٤- پیتی (ن) ، ئەم پیتەش ( وەکو پیتی - ك - ) تەنیا لە (١) ئایەتە پیتدا هاتووە •

پیتی (ن) لە ئایەتە پیتی سورەتی (القلم)دا هاتووە ، وە سەرجەمەکەشی (١٣٣) پیتە لەم سورەتەدا ، واتە پیتی (ن) (١٣٣) جار لە سورەتـــی (القلم)دا هاتووە •

سەیرکە سەیری مانگ‌و رۆژ
ئەستێرەی نێزیك‌و دوور
بیرکەوە لە بارەگاکەی
دەسەلاتی بێ سنوور
چەند بە ووردی رای خستووە
رووی بەرینی بوونەوەر
دانیشگایە ، مامۆستایە
بۆ یەکێ مێشکی لەسەر

**بەکر غەریب فەرەج**

# پیشانگای یەکەم

## پەردەی پێنجەم

## « پالەوانی پیشنگای یەکەم ، یا ژمارە ــ ١٩ »

خوشكو برا موسوڵمانەکانم :ــ قورئانی پیرۆز تـاکە موجـیزەی (المعجزة) نەمریی پێغەمبەرمانە (ص) ، ئەو موجیزەیەیە ، کە تا دونیـا دونیایە ، لەکەی گەنجی خۆی بەرنادات‌و مردن دەنگی نادۆزێتەوە !!

قورئانی پیرۆز ، بە سورەت‌و ئایەتەکانیەوە ، بە ووشەو پیتەکانیەوە ، لە خۆڕاو بەبێ هۆ نەهاتۆتە خوارەوەو ــ مقصودە ــ ، هەر ئایەتێـکی کە سەرنجی دەدەی جیهانێکی سەر بەخۆیەو یاساو سـنووری دیـاری کراوی خۆی هەیەو پێویستی بە قووڵ بوونەوەیەکی فراوان هەیە ٠

ئێستا ، لەم بەشەدا بەرەو ئەستێرەیەك لە بوونەوەری قورئانـی پیرۆزدا دەڕۆین ، بەرەو ئەو ئەستێرەیە دەڕۆین کە تیشکی زانیاری سەدەی ئەتۆم روناکی خستە سەرو سەدەی دڵ چاندن دۆزیەوە !

نا ، ناتوانین بەگشتی‌و بە تێرو تەسەلی باسی ئەو ئەستێرەیــــە بکەین ، بەڵام ئەوەی کە دەیخەینە بەرچاو ، تەنیا ئەو بەشەیە کە چاوی ئامێری ئەلەکترونی دەیبینێت‌و دەستی کورتی زانیاری گەیشتۆتێ !

نا ، جیهانی ئایەتە پیتەکان ، جیهانێکی نوێ نیە ، بەڵکو ئەو ئەستێرە

ونەیە ، کە زیاتر لە (١٤٠٠) ساڵە لەناو بوونـەوەری قورئانـی پیرۆزدا دەسورێتەوەو هەستی پێنەکراوەو بە تەواوی سودی لێ نەبینراوە وەکو پێویستە !

بەڵام ، ئێمە نەمان گووت سودی نیە ، بەڵکو وتمان سودی لـێ نەبینراوە !

بەڵێ دەست دەکەین بە پێش کەش کردنی نمایشی ئایەتە پیتـەکان ، ئەو نمایشەی کە لەسەر شانۆی سەدەی ئەتۆمدا پێش کەش بەم ئاواییە کراو مایەی **قووڵ بوونەوەیە** •

ژمارەی (١٩) ، ئەو ژمارەیە کە توانی لەم ئۆلمپیایەدا دەورێکی وا سەرسوڕهێنەر بهێنێت کە چوك بە دوژمنانی ئاینی ئیسلام بدات •

ژمارەی (١٩) توانی بگاتە پلەی پاڵەوانی ئۆلمپیاکە ، بۆیە ، وا چاکە ژمارەی (١٩) تان پێ بناسێنین بەر لەوەی باسی ئۆلمپیاکە بکەین •

ژمارەی (١٩) چی‌یە ؟ !

ژمارەی (١٩) ، ئەو ژمارەیە کە سەرجەمی پیتەکانی ئایەتە پیتەکان لەو سورەتانەی کە ئایەتە پیتیان هەیە ، ئەگەر دابەش بکەینە سەر ، ئەوا بەبێ مانەوەی هیچ کەرتێك دابەشی دەبێتەسـەر ، وە لـە لاپـەڕەکانی داهاتوودا بە درێژی باسی دەکەین •

ژمارەی (١٩) ئەو ژمارەیەیە کە ڕەگ و ریشەی قورئانی پیرۆزی خستۆتە بەرچاو کە بە چ شێوەیەکی کارەبایی داڕێژراوە !

هەر پیتێك ، وون بێت ، یاخود زیاد بێت ، لەو سورەتانەی کـە ئایەتە پیتیان هەیە ، ئەوا نیشانەیەکی ( سوور ) هەموو قورئانی پـیرۆز دا دەگرێت •

ژمارەی (١٩) ئەو شانۆیەیە کە چیرۆکی نەمری قورئانی پیرۆزی پێش‌کەش بە ئاوایی سەدەی چواردەهەم کردوە •

ئەنجا دوای ئەوەی کە زانیمان ئەگەر پیتەکانی ئایەتە پیتەکان لەو سورەتانەی کە ئایەتە پیتیان هەیـە کـۆ یـکەینەوە ، سەرجەمـی کـۆ کردنەوەکە دابەشی سەر ژمارەی (١٩) دەبێـت بەبێ مانـەوەی هیـــچ کەرتێك •

پرسیارێکی تر سەر هەڵدەدا :ـ

## ئایا ژمارەی (١٩) لە کوێوە هاتووە ؟

ژمارەی (١٩) لە قورئانی پیرۆزەوە سەری هەڵداوە ! ( علیها تسعة عشر ـ ٣١ ـ المدثر ) لە سورەتی (المدثر)دا ژمارەی (١٩) هاتووە ، وە بەر لەم سەدەیەدا ، لێکۆڵەرەوەکان ( موفەسیرەکان ) واتە ( ئەوانەی قورئانی پیرۆزیان شیّ‌کردۆتەوە ) بەگشتی ئـەم ژمارەیـان بـە ژمارەی دەرگاوانەکانی دۆزەخ دانـابوو ، گوایـە دەرگـاوانانی دۆزەخ (١٩) فریشتەن ! ؟

( دکتۆر رەشاد خەلیفە ) کە ژمارەی (١٩)ی بۆ یەکەم جار بـۆ پیتەکانی ئایەتە پیتەکان بەکار هێنا لەم رووەوە دەڵێت :ـ

ژمارەی (١٩) کە لە ئایەتی ـ علیها تسعـة عشر ـ دا هاتـووە ، پەیوەندیەکی زۆری لەگەڵ پیتەکانی ئایەتی ( بسم الله الرحمن الرحیم) هەیە ، واتە ئەو (١٩)یە ژمارەی پیتەکانی ئایەتی ( بسـم اللـه الرحمن الرحیم ) ە ، وە ئایەتی ( بسم الله الرحمن الرحیم ) (١٩) پیتە •

بۆ سەلماندنی ئەم راستی‌یەو وەستان بەرانبەر بەوانـەی ژمـارەی

دەرگاوانانی دۆزەخ بە (١٩) فریشتە دەزانن ، ( دکتۆر رەشـاد ) (١٨) گەلێك بەڵگەی رێکو پێکی هێناوە تەوەو دەڵێت :ــ

---

(١٨) د• رەشاد خەلیفە لە ساڵی (١٩٣٥) دا لە شـاری ( کفـر ) لـە ( میسر ) دا چاوی کردۆتـەوە ، لە دانیشـگای ( عین شمسـ ) دا لە (١٩٥٧) بکالۆریۆسی وەرگرتووە لە بەشی کشتووکاڵ دا •

لە (١٩٦٤) دا لە (کالیفۆرنیا ـ ئەمەریکا) دکتۆرای وەرگرت، ناونیشانی مادەکەی (بەرهەم هێنانی پرۆتین لە پیترۆڵی کال ) دا •

لە (١٩٦٦) دا گەرایەوە (میسر) •

لە (١٩٦٨) دا گەرایەوە بۆ جاری دووەم بۆ ( ئەمەریکا) بـە (مستشار) لە بارەی (انتاج التغذیة الصناعیة) ، لە پاشا بوو بە (خبیر) لە (الامم المتحدة) لە بەشی (التنمیة الصناعیة) ، هەر (ئەمەریکا)دا کچێکی هێنا لە دوای ئەوەی کە کردی بە موسوڵمان ، دکتۆر دەڵێ « ئەم هاوسـەرەم زۆر یارمـەتی داوم لە بارەی ئـەم ـ ئایەتـە پیتانەوە » •

ئەم (ئایەتە پیتانەشی) لە کۆنفرۆسی ئەمـەریکیدا تۆمار کرد لە ( ١١ـ٤ـ١٩٧٢ ) دا لە ژێر ژمارەی ( ٨٣٨٦ ) دا بەو ئاواتـەی گەورەیی قورئانی پیرۆز بـە جیهـانی رۆژ ئاوا بگەیـەنێت • وە نامیلکەیەی بلاوکردەوە بەم ناونیشانە :ــ Miracle Of Quran

وە د• رەشاد زیاتر لە (٦٣) اکتلیون واتە ( ٦٣ ـ ٢٧ خـالی لەگەڵ بێت ••••،•••،•••،•••،•••،•••،•••،•••،•••،٦٣ دەستی لە ئامێری ئەلەکترونیدا بۆ ئەم مەبەستە واتـە بـەکاری هێنـا ! !

قورئانی پیرۆز له جاری یه‌که‌مدا چه‌ند ئایه‌تێك له سوره‌تی (العلق ـ دا هاته خواره‌وه ، وه له جاری سێیه‌مدا چه‌ند ئایه‌تێك له سوره‌تی ـ المزمل ـ دا هاتۆته خواره‌وه ، وه له جاری چوارەم چه‌ند ئایه‌تێك له سوره‌تی ـ المدثر ـ دا هاته خواره‌وه تاكو ئایه‌تی ( علیها تسعة عشر) ، به‌ڵام له جاری پێنجه‌مدا ، واته دوای ئایه‌تی ( علیها تسعة عشر) یه‌كسه‌ر سوره‌تی (الفاتحة ـ هاتۆته خواره‌وه كه ئایه‌تی یه‌كه‌می ( بسم الله الرحمن الرحیم) ه ، پێش هاتنه خواره‌وه‌ی سوره‌تی ( الفاتحة ) ئایه‌تی ( بسم الله الرحمن الرحیم ) له چوار سوره‌ته‌كانی جاڵی یه‌كه‌م نه‌هاتبووه خواره‌وه به‌ڵكو ئایه‌تی (بسم الله الرحمن الرحیم) له دوای ئایه‌تی (علیها تسعة عشر) هاتۆته خواره‌وه له جاری پێنجه‌مدا ، له سوره‌تی (الفاتحة) دا ! !

واته په‌یوه‌ندیه‌كی بنه‌ڕه‌تی‌و پته‌و له نێوان ئه‌م (دوو) ئایه‌ته‌دا هه‌یه، ئه‌مه له‌لایه‌ك ، له‌لایه‌كی‌تریشه‌وه ، ئه‌گه‌ر به وردی سه‌یری سوره‌تی (المدثر) بكه‌ین (كه ژماره‌ی ـ ۱۹ ـ ی تێدا هاتووه ) ده‌بینین ئه‌م سوره‌ته له سه‌ره‌تادا بێ باوه‌ڕێكمان پێ‌ده‌ناسێنێت كه به‌رهه‌ڵستی بڵاوبونه‌وه‌ی ئاینی ئیسلامی كردووه :ـ

« بسم الله الرحمن الرحیم »

( فذلك یومئذ یوم عسیر ★ علی الكافرین غیر یسیر ★ ذرني ومن خلقت وحیدا ★ وجعلت له مالا ممدودا ★ وبنین شهودا ★ ومهدت له تمهیدا ★ ثم یطمع ان ازید ★ كلا انه كان لایاتنا عنیدا ★ سارهقه صعودا ★ انه فكر وقدر ★ فقتل كیف قدر ★ ثم قتل كیف قدر ★ ثم نظر ★ ثم عبس و بسر ★ ثم ادبر واستكبر ★ فقال ان هذا الا سحر یؤثر ★ ان هذا الا قول البشر ★ ساصلیه سقر ★ وما ادریك ما سقر ★ لا تبقی ولا تذر ★ لواحة للبشر ★ علیها تسعة عشر ـ المدثر ) •

وه له ئایه‌ته‌كانی دوای ئه‌م پێناسه‌یه كه ئه‌م بێباوه‌ره قورئانی پیرۆزی به قسه‌ی (ئاده‌میزاد) دانا نه‌ك به فه‌رمووده‌ی خوای گه‌وره ، جا ده‌مێك به (سه‌حر)یان داده‌نا ، وه زانیشمان كه له دۆزه‌خدا به‌شێكی تایبه‌تی بۆ دانرا كه ( سه‌قه‌ره ) .

له دوای پێناسه‌كه‌و (سه‌قه‌ر)دا ئایه‌تی (عليها تسعة عشر ) هاتووه، لێره‌دا پێتانی راده‌گه‌یه‌نین كه هه‌ر پیت‌و ووشه‌یه‌ك له‌م قورئانه پیرۆزه‌دا له كۆمپانیای رێكه‌وت‌دا دانه‌نراون‌و له به‌هاری سروشت‌دا چرۆیان ده‌رنه‌كردوه ، ئه‌وكاته‌ی كه قورئانی پیرۆز له‌ناو باسێك‌دا كه باسی بێ باوه‌رێكه ، ئه‌و بێ باوه‌ره‌ی كه دژی قورئانی پیرۆزه ، ژماره‌ی (١٩)ی هێناوه ، واته په‌یوه‌ندیه‌كی زۆر پته‌و له نێوان قورئانی پیرۆزو ژماره‌ی (١٩) هه‌یه ، هه‌ر وه‌كو په‌یوه‌ندیه‌كی زۆر گه‌وره‌ش له نێوان ژماره‌ی (١٩)و پیته‌كانی ئایه‌تی ( بسم الله الرحمن الرحيم ) هه‌یه .

به‌ڵێ هاتنی ژماره‌ی (١٩) نه‌هاتنی ژماره‌ی (١٨) یا (١٧) یا (٢٥) یا ... یا ... هتد ، به‌بێ هۆنیه ، به‌ڵكو له په‌نای ئه‌م ژماره‌یه‌دا جیهانێكی تایبه‌تی خۆی حه‌شار داوه كه یاساو سنوری دیاری كراوی خۆی هه‌یه !

هاتنی ژماره‌ی (١٩) له دوای پێناسه كردنی ئه‌و ( له‌رێ لاده‌ره‌ی) كه قورئانی پیرۆزی به (سه‌حر) یا به قسه‌ی (ئاده میزاد)دا دانا ، به‌بێ هۆنیه ، به‌ڵكو په‌یوه‌نده‌یه‌كی پته‌و له نێوان قورئانی پیرۆزو ژماره‌ی (١٩) خۆی گرێ ئه‌دا .

د . ره‌شاد ، به‌رده‌وامه له‌سه‌ر سه‌لماندنی ئه‌و راستی‌یه‌ی كه ژماره‌ی (١٩) ژماره‌ی ده‌رگاوانانی دۆزه‌خ نیه ، بۆیه له شوێنێكی تردا ده‌ڵێت :ـ

ئایەتەکانی دوای ئایەتی ( علیها تسعة عشر ) ئەوە دەسەلمێنن ، کە ژمارەی (١٩) فیتنەیەکە (کەتنێکە) لەسەر بێ باوەڕانو بڕوای موسوڵمانان زیاد دەکات •

( علیها تسعة عشر ★ وما جعلنا اصحاب النار الا ملئكة وما جعلنا عدتهم الا فتنة للذين كفروا ليستقن الذين اوتوا الكتاب ويزداد الذين امنوا ايمانا ولا يرتاب الذين اوتوا الكتاب والمؤمنون وليقول الذين في قلوبهم مرض والكافرون ماذا اراد الله بهذا مثلا كذلك يضل الله من يشاء ويهدي من يشاء وما يعلم جنود ربك الا هو وما هي الا ذكرى للبشر ـ المدثر ) •

ئەم چەپکە ئایەتە بۆنداره کە لە دوای ئایەتی ( علیها تسعة عشر ) هاتووە زیاتر ئەوەی ئاشکرا دەکات کە ژمارەی (١٩) یەکێکە لە نهێنیەکانی قورئانی پیرۆز کە بومەلەرزەی نەمانو فیتنە دەخاتە دڵی بێ باوەڕانو گومان لە دڵی خاوەن نامەکان نایەڵێت لە رووی پاکی قورئانی پیرۆزو بەتین کردنی بڕوای بڕوا داران زیاتر دەکات ، ئەمە بەلای ( د• رەشاد ) ەوە توانای ژمارە (١٩)یە ، نەك تەنیا ژمارەی دەرگاوانانی دۆزەخ !

★ ★ ★

لە شوێنێکی تردا دکتۆر رەشاد دەڵێت :ـ

یەکەم سورەت کە هاتە خوارەوە سورەتی (العلق)ە ، سورەتی (العلق) (١٩) ئایەتە ، وە (١٩) مین سورەتە لە سورەتەکانی قورئانی پیرۆز •

ئەم نهێنیەش بەلای دکتۆرەوە هەر بەڵگەی ئەوەیە کە ژمارەی (١٩) پەیوەندی لەگەل قورئانی پیرۆزە !

★ ★ ★

وه له شوێنێکی تردا دەڵێت :ـ

ژمارەی (١٩) سەرەتاو کۆتایی هەموو ژمارەیەکە لەم بوونەوەرەدا، هەر ژمارەیەکی کە دەیبینیت لەم بوونەوەرەدا ، لە ژمارەکانــی نێــوان ژمارەی (١)و (٩) دایە ، واتە ژمارەی (١٩) سەرەتاو کۆتایی هەموو ژمارەیەکە ..

بەڵگەیەکی زیندوو تریشمان بە دەستەوەیە لە بارەی پەیوەندی ئەم ئایەتە پیتانە بە قورئانی پیرۆزەوە ، ئەگەر بە ووردی سەیری ئایەتەکانــی دوای ئایەتە پیتەکان بکەین (١٩) ، دەبینین لە (٨٢٪)ی ئەم ئایەتانە ، ووشەی قورئانی پیرۆزی تێدایەو باسی پاکیو گەورەیی قورئانی پیرۆز دەکات ، بۆ نموونە :ـ

( الـم ★ ذلك « الكتاب » لا ريب فيه ـ البقرة ) .

( يس ★ « والقران » الحكيم ـ يس ) .

( ق ★ « والقران » المجيد ـ ق ) .

( الر ★ تلك « ايات الكتاب و قران » مبين ـ الحجر ) ...

★ ★ ★

لێرەدا ، لە دوای ئەوەی کە بە کورتی باسی چۆنیەتی هاتنی ژمارەی (١٩)مان کرد ، بەکورتی باسی چۆنیەتی پەیوەندی نێوان ئایەتە پیتەکانو قورئانی پیرۆزمان کرد ، ئێستاش یەك لە دوای یەك تابلۆکانی نمایشەکەمان پێش کەش دەکەین بەو ئامانجەی سودی موسوڵمانانی هەبێــتو لە پێناوی رەزامەندی خوای گەورە بێت ( ان شاء الله ) .

---

١٩ـ بروانە پەردەی یەکەم بە وردی .

تابلۆی (١) :ــ پیتی (أ) ، ئەگەر سەیری پیتی (أ) بکەین کە ــلە (١٣) ئایەتە پیتدا بەشداری کردوە ، دەبینین سەرجەمی لەهەر (١٣) سورەتدا کەپیتی (أ) لە ئایەتە پیتەکەیاندا هاتووە بەم شێوەیەی خوارەوەیە (٢٠) :ــ

| ز | سورەتەکان | ژمارەی دووبارە بوونەوەی پیتی (أ) تیایاندا |
|---|---|---|
| ١ | البقرة | ٤٥٩٢ |
| ٢ | ال عمران | ٢٥٧٨ |
| ٣ | الاعراف | ٢٥٧٢ |
| ٤ | یونس | ١٣٥٣ |
| ٥ | هــــود | ١٤٠٢ |
| ٦ | یوسف | ١٣٣٥ |
| ٧ | الرعد | ٦٢٥ |
| ٨ | ابراهیم | ٥٩٤ |
| ٩ | الحجر | ٥٠٤ |
| ١٠ | العنکبوت | ٧٨٤ |
| ١١ | الروم | ٥٤٥ |
| ١٢ | لقمان | ٣٤٨ |
| ١٣ | السجدة | ٢٦٨ |
| | | ١٧٤٩٩ |

٢٠ــ راستە لە بەشی (٤)ی پیشانگای (١)دا باسی ئەمخشتانەمان کرد ، بەلاّم دووبارە بوونی ئەم (٨) خشتەیە بۆ نزیك بوونەوەی تابلۆکانی بەشی پێنجەمە !

واته پیتی (أ) لەهەر (١٣) سورەتدا دەکات ( ١٧٤٩٩) پیت ، وە ژمارەی (١٧٤٩٩) دابەشـی سەر ژمارەی (١٩) دەبێت بەبێ مانەوەی هیـچ کەرتێك :ـ

١٧٤٩٩ ÷ ١٩ = ٩٢١ ! !

★ ★ ★

تابلۆی (٢) :ـ پیتی (ل) ، ئەم پیتە وەکو پیتی (أ) لە (١٣) ئایەتە پیت دا بەشداری کردوە ، وە سەرجەمی پیتی (ل) لەهەر (١٣) سورەتدا کە پیتی (ل) لە ئایەتە پیتیانە بەم شێوەیە :ـ

| ز | سورەتەکان | ژمارەی دوویارە بوونەوەی پیتی (ل) تیایاندا |
|---|---|---|
| ١ | البقرة | ٣٢٠٤ |
| ٢ | ال عمران | ١٨٨٥ |
| ٣ | الاعراف | ١٥٢٣ |
| ٤ | یونس | ٩١٢ |
| ٥ | هــود | ٧٨٨ |
| ٦ | یوسف | ٨١٢ |
| ٧ | الرعد | ٤٧٩ |
| ٨ | ابراهیم | ٤٥٢ |
| ٩ | الحجر | ٣٢٣ |
| | | ٥٥٤ |
| ١٠ | العنكبوت | ٥٠٤ |
| ١١ | الروم | ٣٩٦ |
| ١٢ | لقمان | ٢٩٨ |
| ١٣ | السجدة | ١٥٤ |
| | | ١١٧٨٠ |

وانە پیتی (ل) لەم (١٣) سورەتەدا (١١٧٨٠) جار دووبارە بۆتەوە ، ژمارەی (١١٧٨٠) دابەشی سەر ژمارەی (١٩) دەبێت بەبێ مانەوەی هیچ کەرتێك :ــ

١١٧٨٠ ÷ ١٩ = ٦٢٠ ! !

تابلۆی (٣) :ــ★ پیتی ( م ) ، ئەم پیتە لە هەموو پیتەکانی ئایەتە پیتەکان زیاتر بەشداری کردوە لە ئایەتە پیتەکاندا ، پیتی (م) لە (١٧) ئایەتە پیتدا هاتووە ، وە سەرجەمی لە هەر (١٧) سورەتدا کە پیتی (م) لە ئایەتە پیتیانە بەم شێوەیەیە (٢١) :ــ

---

( دوو بروسکە )

★ هەر برایەك تێبینیەکی هەیە ، تکایە زۆر سوپاسی دەکەین کە لەسەر ناونیشانی دیاری کراو بۆمان رەوانە بکات ، بەڵکو لە چاپی دووەم دا سودی لێ وەربگرین •

★ پێمان خۆش بوو ( جیهانێکی وون ) بخەینەوە بەرچاپ بەلام ( نازانم بۆ بۆمان نەکرا ) بمان بوورن •

(ان شاء الله) ئەگەر ماوەمان ( هەبوو ) بە ماوەیەکی زوو دەیخەینە بەر چاپ ! ! ؟

٢١ــ کە دەڵێین لە هەموو پیتەکان زیاتر بەشداری کردوە لە دروست کردنی ئایەتە پیتەکاندا ( لە ــ ١٧ ــ ئایەتە پیتدا هاتووە ) ، نیاز زۆری بەشداری کردنیەتی لە ئایەتە پیتەکاندا نەك زۆری دووبارە بونەوەی لەم سورەتانەی کە پیتی (م) لە ئایەتە پیتیانە •

| ژ | سوره‌ته‌کان | ژمـاره‌ی دووباره بوونه‌وه‌ی پیتی (م) تیایاندا |
|---|---|---|
| ١ | البقرة | ٢١٩٥ |
| ٢ | ال عمران | ١٢٥١ |
| ٣ | الاعراف | ١١٦٥ |
| ٤ | الرعد | ٢٦٠ |
| ٥ | الشعراء | ٤٨٩ |
| ٥ | القصص | ٤٦١ |
| ٧ | العنكبوت | ٣٤١ |
| ٨ | الروم | ٣١٨ |
| ٩ | لقمان | ١٧٧ |
| ١٠ | السجدة | ١٥٨ |
| ١١ | غافر | ٣٨٩ |
| ١٢ | فصلت | ٢٧٦ |
| ١٣ | الشورى | ٣٠٨ ( له ئايه‌تى (١) |
| ١٤ | الزخرف | ٣١٧ |
| ١٥ | الدخان | ١٤٥ |
| ١٦ | الجاثية | ٢٠٠ |
| ١٧ | الاحقاف | ٢٢٧ |
| | | ٨٦٨٣ |

گەواتە پیتی (م) لەهەر (١٧) سورەتدا دەگاتە (٨٦٨٣) پیت ، وە ژمارەی (٨٦٨٣) دابەشی سەر ژمارەی (١٩) دەبێت بەبێ مانەوەی هیچ کەرتێك •

٤٥٧ = ١٩ ÷ ٨٦٨٣

★ ★ ★

خوشك‌و برا موسوڵمانەکانم :ـ ئێمە کە سەیری ئـەم تابلۆیانـە دەکەین ، بانگ نەکراوین ، نا ، نـا بانـگ نەکراویـن تاکـو فێری چۆنیەتی ( کۆ ) و ( دابەش کردن ) بین !

بەلکو لەسەر کەناری قورئانی پیرۆزدا دەوەستین‌و سەیری ئـەم دەسەلاتە بێ سنوورە دەکەین کە بەچ شێوەیەك ئەم پیتانەی داناوەو بەچ شێوەیەك ، لە ماوەی ئەم (١٤٠٠) سالەدا ، ئەم پیتانەی پاراسـتووە بە زیندوویەتی ، ئەگەر ووشەیەك پیتی (أ) یا (ل) یا (م)ی تیا بوایەو لەم (١٣) سورەتەدا کە باسمان کرد کە زیاتر لە (٢٠) هەزار ووشەیـە ، لا بچووبایە ، یا زیاتر بووایە ، ئەوا ئیمرۆ زمانی ئامێری ئەلەکترونـی چەند درێژ دەبوو بەرانبەر بە قورئانی پیرۆزمان ، یا ئەگەر لە ئایەتـە پیتێکدا لەم (٣٠) ئایەتە پیتەدا پیتێکی وەك پیتی (أ) یـا (ل) یا (م) یـا هەر پیتێکی تری ئایەتە پیتەکان نەمابایە ئەوا ئیمرۆ چ بۆشاییێکی گەورە دەکەوتە ناو جیهانی قورئانی پیرۆزەوە •

بەلام خواوەندی گەورە دەفەرموویێت ( أنا نحن نزلنا الذکر وانـا له لحافظون ) •

واتە (ئێمە قورئانی پیرۆزمان ناردۆتە خوارەوەو ئێمەش دەیپارێزین) بەڵێ ، ئەم تابلۆیانە بەلگەی ئەم راستیەن !

★ ★ ★

تابلۆی (٤) :ــ پیتی (ر) ، ئەم پیتە لەناو هەر (٣٠) ئایەتە پیتەکانــدا تەنیا لە (٦) ئایەتە پیتدا بەشداری کردوەو سەرجەمەکەشی لەهەر (٦) سورەتەکەی کە پیتی (ر) لە ئایەتە پیتیانە بەم شێوەیەیە :ــ

| ز | سورەتەکان | ژمــارەی دووبارە بوونەوەی پیتی (ر) تیایاندا |
| --- | --- | --- |
| ١ | یونس | ٢٥٧ |
| ٢ | هــود | ٣٢٤ |
| ٣ | یوسف | ٢٥٨ |
| ٤ | الرعد | ١٣٧ |
| ٥ | ابراهیم | ١٦٠ |
| ٦ | الحجر | ٩٩ |
| | | ١٢٣٥ |

کەواتە پیتی (ر) (١٢٣٥) جــار لــەم (٦) ســورەتەدا هاتووە ، وە ژمارەی (١٢٣٥) بەبێ مانەوەی هیچ کەرتێك دابەشی سەر ژمارەی (١٩) دەبێت :ــ

١٢٣٥ ÷ ١٩ = ٦٥

★ ★ ★

تابلۆی (٥) :ــ پیتی (ص) :ــ ئەم پیتە تەنیا لە (٣) ئایەتە پیتدا هاتووە ، وە سەرجەمی لەهەر (٣) سورەتەکەدا کە پیتی (ص) لە ئایەتە پیتیانە بەم شێوەیە :ــ

| ز | سورەتەکان | ژمـارەی دووبارە بوونەوەی پیتی (ص) تیایاندا |
|---|---|---|
| ١ | الاعراف | ٩٨ |
| ٢ | مريم | ٢٦ |
| ٣ | ص | ٢٨ |
| | | ١٥٢ |

ژمارەی (١٥٢) دابەشی سەر ژمارەی (١٩) دەبێت ، بەبێ مانەوەی هیچ کەرتێك :ــ

١٥٢ ÷ ١٩ = ٨ ! !

★ ★ ★

تابلۆی (٦) :ــ پیتی (ح) ، ئەم پیتە لە (٧) ئایەتە پیتدا بەشداری کردوە ، وە سەرجەمی ئەم پیتە لە هەر (٧) سورەتەکەی کە پیتی (ح) لە ئایەتە پیتیانە بەم شێوەیەی خوارەوەیە :ــ

| ز | سورەتەکان | ژمـارەی دوبارە بوونەوەی پیتی (ح) تیایاندا |
|---|---|---|
| ١ | غافر | ٦٤ |
| ٢ | فصلت | ٥٨ |
| ٣ | الشورى | ٥٣ |
| ٤ | الزخرف | ٤٥ |
| ٥ | الدخان | ١٦ |
| ٦ | الجاثية | ٣١ |
| ٧ | الاحقاف | ٣٧ |
| | | ٣٠٤ |

بەڵێ ژمارەی (٣٠٤) بەبێ مانەوەی هیچ کەرتێك دابەشی سەر ژمارەی (١٩) دەبێت :ـ

٣٠٤ ÷ ١٩ = ١٦ ·

★ ★ ★

تا بلۆی (٧) : ـ پیتی (ق) ، ئەم پیتە تەنیا لە (٢) ئایەتە پیتدا هاتووە ، وە سەرجەمی ئەم پیتە لەم (٢) سورەتەدا کە پیتی (ق) لەئایەتە پیتیانە بەم شێوەیەی خوارەوەیە :ـ

ژمارەی پیتی ( ق ) لە سورەتی (الشوری) دا = ٥٧

ژمارەی پیتی ( ق ) لە سورەتی ( ق ) دا = ٥٧

سەر جەمەکەشی ( ١١٤ ) پیتە

وە ژمارەی (١١٤) بەبێ مانەوەی هیچ کەرتێك دابەشی سەر ژمارەی (١٩) دەبێت :ـ

١١٤ ÷ ١٩ = ٦

★ ★ ★

تابلۆی (٨) :ـ پیتی (ن) ، ئەم پیتە تەنیا لە (١) ئایەتە پیتدا هاتووە، پیتی (ن) تەنیا لە ئایەتە پیتی سورەتی (القلم) دا هاتووە ، وە سەرجەمی پیتی (ن) لە سورەتی (القلم) دا (١٣٣) پیتە ، وە ژمارەی (١٣٣) بەبێ مانەوەی هیچ کەرتێك دابەشی سەر ژمارەی (١٩) دەبێت :ـ

١٣٣ ÷ ١٩ = ٧

★ ★ ★

ئاسکیی قورئانی پیرۆزمان ، تەنیا لە ئایەتە پیتەکانیدا نیەو بەس ، بەڵکو واتاکانیشی ئاسکترە لە جیهانی ئایەتە پیتەکانی :ـ

لەســەر دەمی پێغەمبــەردا (ص) زۆربــەی بێ بــاوەڕان ــ یا بــە گشتی‌یان ــ گاڵتەیان بە ئایینی ئیســلام دەکردو هــەر ئایەتێــك بهاتایــە خوارەوە ، لە دژی دەوەستان ، ( زیندوو بونەوە ) واتە لێپرسینەوەی رۆژی دوایی لەلایان لە هەموو زامێك گەورەترو بەژانتر بوو ، بەهەشتی بەرین‌و دۆزەخ ، هەردەم دژی ئەم چەشنە باسە بوون ، بەڵام سـەیری قـورئانی پیرۆز بکە بە چ شـێوەیەکی پـر لـە وردەکاری وەڵامیـان دەداتـەوە ! [ لا اقسم بيوم القيمة ★ ولا اقسم بالنفس اللوامة ★ ايحسب الانسان الن نجمع عظامه ★ بلى قادرين على ان نسوي بنانه ] ــ القيامة ــ •

خـوای گـەورە ، لە ئایــەتی یەکەمدا ، ســوێند بە رۆژی دوایی دەخوات ، هەر چەند بێ‌باوەڕکانیشــ بڕوایان بــە رۆژی دوایی نیــە ، بفەرموو سەیری شێوەی سوێند خواردنەکەشی بکە چۆن هاتووە (لا اقسم)، ئەم جۆرە سوێندە لە کاتێك‌دا بەکار دێت کە تاوانێك بخرێتــە ئەستــۆی یەکێ‌و کابراش ئاگاداری باسەکە نەبێت ، بۆیە کابرا دەڵێت (من سوێند ناخۆم بە سەری فلان کە خۆشەویسترین کەسیشمە) ، نیاز لــەم جــۆرە سوێندە بێ تاوانی‌ی ئەو کەسەیە کە بە تاوانبار دانراوە لەناو عەرەبەکان‌دا ئەم‌جۆرە سوێندە زۆر تەشەنەی کردبوو ، بۆیە خوای گەورە نا فەرمووێت [ انا اقسم بيوم القيامة ) بەلکو بە ( لا اقســم ) ســوێند دەخوات ، لــە راستیش‌دا ( لا اقسم ] هەر بەواتای ( انا اقسم ) دێت ، بۆیەش دەڵێت ( يوم القيامــة ) چونکــە لە تــەرازوی ئایینی ئیســلامدا ، ئــەم رۆژە ، پیرۆزترین رۆژە ، بۆیە خوای گەورە سوێندی پێ دەخوات ، رۆژی دوایی ئەو رۆژەیە ، کە هەموو ئادەمیزادێك ، بەرانبــەر بە ( یاســا ) و ( پرۆگرامی ) ئەو رۆژە یەکسانە ، نە بڕوانامەو نە خزم خزمانێ‌و نە ( نەوەی فلانی کوڕی فلانی ••• ) کێشیان نیە ، بەلکو ( کێشی ) ئــەو

رۆژە خواپەرستیەکی پاکو لانەدانـە لە پرۆگرامی قـورئانی پیـرۆزو فەرموودەکانی پێشەوامان ( ص ) بـۆ ئەو یاسا نا سازانەی کە ئادەمیزاد دەیتراشێت !

کێشی رۆژی دوایی ، ئەو (کیلۆ) یەیە کە تەنیا گرانی چاکـەی موسولمانان هەڵدەکێشێت بەرانبەر بە موسولمـانانی‌تر ، چونکـە ئەگـەر بەوردی سەیری یاساکانی قورئانی پیرۆزو پێغەمبەرمان (ص) بکەین ، سەرجەمی هەموو ( مادەکانیان ) بۆ چاکە کردنی مقسولمانانە لەگەڵ ( ئادەمیزاد ) دا !

وە ئایەتی دووەمیشی هەر سوێندەو هەر بە شێوەی ئایەتی یەکەمە ( لا اقسم ) ، بەلاَم لە ئایـەتی دووەمدا ، سوێند بـەو کەسانەیـە کـە تاوانێکیان کرد ، ئەوا هەر بە خۆیان زوو هەست بە تاوانەکە دەکـەنو خۆیان خۆیان سزا دەدەنو بەسەر خۆیان دەڕۆنو پەیمـان دەدەن کـە جارێکی‌تر کاریوا نەکەن ( لا اقسم بالنفس اللوامه ) ، چونکـە ئـەم جۆرە ئاداەمیزادانە لەلایەن خـوای گـەورەوە زۆر گەورەیـە ، بۆیـە سوێندیان پێ دەخوات ، ئەگەر ئادەمیزاد کە کارێکی خراپی کرد لەناو کۆمەلداو بەبێ هیچ ئامۆژگاری کەرێك خۆی چارەسەری خۆی کردو پەیمانی دا کە جارێکی‌تر کاری واناکاتو نایەتەوەسەر ئەم کارە خراپانە ئەوا نیشانەی چاکەیە •

ئاینی ئیســـلام ، ماوەیەکی فـراوانی داناوە بـۆ گەڕانـەوە لـە خراپەکاری ، تۆبەکردن ( التوبة ) ( گەڕانەوە لە خراپـە ) لـە لایـەن ئاینی ئیسلامەوە ، گەورەترین چاکەیـە کـە خـوای گەورە لەگـەڵ

ئادەمیزاددا کردویەتی ، بە تایبەتی ئەگەر لەدوای تۆبە کردنەکەش ئەو ئادەمیزادە ، سەر زەنشتی خۆی بکاتو پەیمان بدات کـە جارێـکی‌تر کاری‌وا دووپات نەکاتەوە .

بەڵێ خوای گەورە ، لە دوای ئەوەی کە لە ئایەتی یەکەمدا سوێندی بە رۆژی دوایی خوارد وە لە ئایەتی دووەمدا سوێنـدی خـوارد بـەو کەسانەی کە خراپەیەکیان کرد خۆیان ، خۆیان ، دەشکێننەوەو چارەسەری خۆیان دەکەن . لە دوای ئەم دو سوێندەدا خـوای گەورە لە ئایـەتی سێیەمدا دەفەرمووێت ( ایحسب الانسان الن نجمـع عظامـه ) ، واتـە ئادەمیزاد ( نیاز لە ئادەمیزادی بێ باوەڕەو بەسـن ) وای دەزانێت کـە ئێسکەکانی کۆ ناکرێتەوە واتە نابێتەوە بەو ئادەمیزادەی دونیا !

لە ئایەتی چوارەمدا ، دەفەرمووێت ( بلى قادرين على ان نسـوي بنانه ) لێرەدا خوای گەورە دەستی بۆ وەتەرێکی ژا هەستیار درێژ کرد لە ( بۆدی ) ئادەمیزاددا کە تا دونیا دونیایە ئەم وەڵامە بەسە ، بەسە بۆ ئەوانەی بڕوایان بە رۆژی دوایی نیە !

**خوشکانو براکانم :ـ**

زۆر بەمرانی ئاگادا ربن ، لەسـەر دەمی ( جـاهیلـی ) دا ، کە ئـەم قورئانـە پـیرۆزە هاتـە خـوارەوەو ئـەم ئایـەتـە پیرۆزەی تێدا بوو ، ( عەرەبەکان ) یا ( بێ باوەڕەکان ) جوانترینو گرنـگترین بەش لە لەشی ئادەمیزاد دا بەلایانەوە ( چاوی گەش ) بوو یا ( کوڵمی ئاڵ ) و ( قەدی باریك ) و ( مـەمکی خـڕ ) یا ... یا ... هتـد ، چونکە بەلای ئەم بێ باوەڕانە ، ئەم شوێنانە گرنگ بوون بۆیە بە زۆری چاومان بەم شتانە دەکەوێت کە سەیری ( هۆنراوە ) و ( کە لە پوورە ئەدەبیەکانیان دەکەین ) ، کەچی قورئانی پیرۆز لە جیاتی ئەوەی ناوی

زیندوو بوونەوەی (چاو) یا (دل) یان بۆ بکات دەفەرمووێت ( بلی قادرین علی ان نسوي بنانه ) واتە ( ئێمە تواناماں هەیە کە سەرە پەنجەکانیشتان زیندوو بکەینەوە ) ، لێرەدا دەپرسین ، باشە کە ( چاو ) یا ( مەمك ) یا ... یا ... هتد ، لەلایەن بێ باوەڕەکاندا شتێکی گرنگ بوو ، بۆچی قورئانی پیرۆز نافەرمووێت ( بەڵێ تواناماں هەیە ( زمانیشتان ) یا ( چاویشتان یا ... یا ... هتد ، سەر لەنوێ زیندوو بکەینەوە !

چونکە ئادەمیزاد تەنیا دەرەوەی شت دەبینێت‌و بەس ، ئاگاداری نهێنیەکانی ژوورەوەو وردەکاریە شاراوەکانی‌تر نیە ، تا ... تا ... خوای گەورە ، تەنیا لەگەڵ ئادەمیزادی سەدەی هاتنە خوارەوەی قورئانی پیرۆزمانی نیەو بەس ، بەڵکو با ئادەمیزادەکانی کە لە سەدەی ئەتۆمدا دەژین‌و تەمەنی شەو لە تاقیگاکانی روسیاو بۆن‌و ئەکسفۆرد دا دەبەنەسەر با زۆر باش بزانن ، کە هەموو بەرهەمەکانیان تەنیا دۆزینەوەیە ، نەك دروست کردن ، لە نەبوونەوە ، کام ( گازە ) کە پیاوە لێ هاتووەکانی تاقیگا دەڵێن ئێمە لە نەبوونەوە دروستمان کرد ؟ !

کام خانەیە (خلية) کە لەبەرهەمی ڕەنجە بێ پسانەوەکەیانە ؟! بەڵێ کام مادەیە ــ کە بۆیان دروست کردین لە نەبوونەوە ؟! کام ئەتۆم‌و کام ئەلەکترون‌و پرۆتۆنە ... کام ... کام ... هتد ؟!



لێرەدا ، نیاز نە نرخاندی زانستەو نە لادانە لە مادە ! بەڵام خستنە سەر چۆکی ( دینامیکی ) یەتی قورئانی پیرۆزە کە چۆن دوورە لە (کات‌و شوێن ) تا ، ناتوانن کەوی بکەن !

ئەو ئایەتەی کە دەڵێت بەڵێ تواناماں هەیە کە سەرە پەنجەکانتان زیندوو بکەینەوە ، لە شاری (مەکە)دا بەر لە (١٤٠٠) ساڵ ، هاتە خوارەوە ، بەڵام ئێرۆ کە گەنجێکی هۆشمەندی (هولێر) یا (پەکین)

یا (کالیفۆرنیا) سەیری ئەم ئایەتە بکات ، ئەوا هیچ هەست ناکات کـە زیاتر لە (١٤٠٠) ساڵ پێش ئیمرۆ بۆ شاری مەکە هاتۆتە خوارەوە ، بەڵکو ئەم ئایەتە (نەك تەنیا ئەم ـ ئایەتە ـ بەڵکو هەموو ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز) گەلێك بە کارترە لەو رۆژەی کە تیایـدا هاتۆتـە خوارەوەو لەلایەن ئاوایی ئەو شارەی کە تیایە هاتۆتە خوارەوە • ئەمانە هەمووی بەڵگەی (ئەزەلی)و نەمری قورئانی پیرۆزن بۆ بێ باوەڕان ، بەڵێ ، بەس بۆ بێباوەڕان ، ئەگینا موسوڵمانان (سوپاس بۆ خوای گەورە) چاوەنواڕی ئەم هەموو دوو دڵیو سەرئێشیە نینو چی دەبینێتو چی نابینێت خوای گەورە دروستی کردوەو وەستان دویەتی !!

بەڵێ ، خوای گەورە لەناو ئەو ئامێرە هەزار بە هەزارانەی لەشدا، تەنیا باسی زیندوو بوونەوەی سەرە پەنجەی کرد ، کەچی بێباوەڕان ، کەئێسکی سەری ئادەمیزادیان لە خـاك دەردەهێناو دەهاتنـە خزمـەت پێغەمبەرو (ص) دەیان گووت ( خوای تۆ ئا ئـەم سەلکەشـی زینـدوو دەکاتەوە ) ؟ !

ئەم ئایەتە زۆرکاری تێ نەکردن ، بەلای ئەوانەوە مادەکە ( کە خوای گەورە دەفەرمووێت سەرە پەنجەکانیشتان زیندوو دەکەمـەوە ) جێگای سەرسام نەبوو بەقەد ئیمرۆ کە مادەیەکی زۆر داهێنەرە ، ئـەم ئایەتە یا با بلێین ئەم وەڵامە بەبێ ئەوەی تواناکەی بخرێتەکار ، مایەوە، تاکو لە کاتی دیاری کراودا کە خوای گەورە چرکەی سفری بـــۆ دانابۆوە تەقیەوە ، بەلام لەچ کاتێكو لەچ شارێكدا ئەم ئایەتە زەنگی نەمریی خۆی لێدا ، کە مایەی سەر سوڕمانە ، لەلایەن ئادەمیزادێکی هۆشمەند ، ئەم ئایەتە لە دوای ئەوەی کە زانیمان لە شاری (مەکە )دا هاتە خوارەوەو بەرلە (١٤٠٠) ساڵدا ، کەچی لە کێشوەری ( کۆشکی هەوربر ) دا تەقیەوە لە سەدەی ئەتۆمدا تەقیەوە !

زاناکان ، ئەو زانایانەی کە بێباوەڕن ، نەزانن بە گەورەیی ئەو خوایەی کە تاکو خاوەن دەسەڵاتە ، بە یەك دەنگ ڕایـان گەیاندکـە خوای گەورە باشترین وەڵامی داوەتەوە بۆ ئەوانەی کە بڕوایان بە زیندوو بوونەوە نیە ، ئەم زانایانە لە دوای ئەوەی کە سەرە پەنجەی زیـاتر لە (۱۰٫۰۰۰) کەسیان سەیر کرد ، ئەوسا نهێنیەکی زۆر گەورەیان دۆزیەوە، لە دوا ڕاپۆرتیاندا رایان گەیاند کە ئادەمـیزاد پەنجەکانی زۆر زۆر بـە وردی دروست کراوەو هیچ ئامێرێکی ئەلەکترونیی‌وا وردنیە ! وە گوتیان :ـ هەر پەنجەیەك دیکۆرێکی جیاوازی هەیە ، دیکۆری هیچ پەنجەیەك بـــە دیکۆری پەنجەکانی‌تر ناچێت ، نەك بە دیکۆری پەنجەکانی ئادەمیزادێکی‌تر ناچێتو بەس ، بەڵکو زاناکان دەڵێن ، لەو ڕۆژەوە کە ئادەمیزاد دروست کراوە ، تا ئیمرۆشـں نەزانراوەو ناش زانرێت کە دیکـۆری پەنجـەی ئادەمیزادێك بە دیکۆری پەنجەی ئادەمیزادێکی‌تر بچێت ، نە پەنجەی باوكو دایك بە کوڕو کیچو خزمەکانیان دەچێتو نە پەنجەی منداڵ بە پەنجـەی دایكو باوکی ، بەلکو هەر ئادەمیزادێك (۱۰) نەخشەی دیاری کراوی تایبەتی بۆ دانراوە کە جیاوازە لەگەڵ نەخشەی هەموو ئادەمیزادەکانی‌تر .

لە نووسینگەی فیدرالی ـ الولايات المتحدة ـ دا (۱۷۰) ملێون پەنجەی ئادەمیزاد تۆمار کراوەو تا ئێستا لە یەك چونی (۱) پەنجە لەناو پەنجەکانی ئەم ( ۱۷۰٫۰۰۰٫۰۰۰ ) ئادەمیزادە بە پەنجەی ئادەمیزادێکی‌تر ناچێت !

بەڵێ ! ئەوکاتەی کە تاقیگا نەبـوو ، ئـەو کاتـەی کە قوتابخانەو دانیشگا نەبوو ، زانیاری بەهەموو بەشەکانیـەوە هـەر ناویشی نەبـوو ، لەوکاتەی کە نووسین لەسەر پێستو بەردو دار بوو ئا لەوکاتەدا قورئانی پیرۆز ئەم ڕاستی‌یەی ڕاگەیاند کە سەرە پەنجەکانیشتان زیندوو دەکەینەوە،

نـا ، نـا ئەمە کارێکی سەیرنیە لە بارەگای قورئانی پیرۆزەوە کە پەنجە درێژ دەکات بۆ ئەم دیکۆرە جیاوازانە ، بەڵکو قورئانی پیرۆز خۆی لـە خۆیدا موجیزەیە !

بەڵێ ، بەڵێ بەم شێوەیە خوای گەورە لە وەڵامی ئەم بێ باوەڕانەدا ( چ بێ باوەڕانی سەدەی ئەتۆم ) کە بەهیچ جۆرێ بڕوایان بە زیندوو بوونەوەنیە ، پێی ووتن ئێمە توانامان هەیە کە سەرە پەنجـەکانیشتان زیندوو بکەینەوە !

ڕاگەیاندنی ئەم هەواڵە بەڵگەی زیندوو بوونەوەی ئامادەمیـزادە لـــە پاشە رۆژدا !

ئەم خوایەی کە ئەم تابلۆیانەی لە ئایەتە پیتەکاندا داناوە !

ئەو خوایەی کە ئاگاداری دیکۆری سەرە پەنجەکانمانە ! بەڵـــێ خوشك‌و براکانم !

بەڵێ ئەی بێ باوەڕان ئا ئەم خوایە ، بەیانی لە خەوی مردندا ، وە ئاگامان دەیەنێت‌و هەر کەسە ، بەپێی کـردەوەی خـۆی ، سزاو پاداشت وەردەگرێت .

★ ★ ★

ئێمە لەهەر (٨) تابلۆی ڕابردودا تەنیا باسی چەند پیتێکی ئایەتـی پیتەکانمان کرد ، کە چۆن بە تەنیا ، سەرجەمەکانیان لە سورەتەکانیـان دابەشی سەر ژمارەی (١٩) دەبن بەبێ مانەوەی هیچ کەرتێك .

ئێستاش (١٤) تابلۆی ترتان پێش‌کەش دەکەین لەبارەی ئەو پیتانەی کە بەیەکەوە لە ئایەتە پیتدا بەشداریان کردوە .

★ ★ ★

تابلۆی (٩) :ــ پیتەکانی ( أ ل م ) ، ئەم (٣) پیتە تەنیا لە (٨) ئایەتە پیتدا بەیەکەوە هاتوون ، وە سەرجەمی ئەم (٣) پیتــە لــەم (٨) سورەتەی کە ئەم (٣) پیتە بەیەکەوە لە ئایەتە پیتەکانیان هاتوون بـــەم شێوەیەیە : ــ

| ز | سورەتەکان | ژمارەی دووبارە بوونەوەی پیتی أ | ل | م | سەرجەمەکانیان |
|---|---|---|---|---|---|
| ١ | البقرة | ٤٥٩٢ | ٣٢٠٤ | ٢١٩٥ | ٩٩٩١ |
| ٢ | ال‌عمران | ٢٥٧٨ | ١٨٨٥ | ١٢٥١ | ٥٧١٤ |
| ٣ | الاعراف | ٢٥٧٢ | ١٥٢٣ | ١١٦٥ | ٥٢٦٠ |
| ٤ | الرعد | ٦٢٥ | ٤٧٩ | ٢٦٠ | ١٣٦٤ |
| ٥ | العنكبوت | ٧٨٤ | ٥٥٤ | ٣٤٧ | ١٦٨٥ |
| ٦ | الروم | ٥٤٥ | ٣٩٦ | ٣١٨ | ١٢٥٩ |
| ٧ | لقمان | ٣٤٨ | ٢٩٨ | ١٧٧ | ٨٢٣ |
| ٨ | السجدة | ٢٦٨ | ١٥٤ | ١٥٢ | ٥٨٠ |
| | | ١٢٣١٣ | ٨٥١٣ | ٥٨٤١ | ٢٦٦٧٦ |

واتە سەرجەمی ئەم (٣) پیتە لەهەر (٨) سورەتەکەدا دەکـــات (٢٦٦٧٦) وە ئەم ژمارەیەش بەبێ مانەوەی هیچ کەرتێك دابەشی ســەر ژمارەی (١٩) دەبێت : ــ

٢٦٦٧٦ ÷ ١٩ = ١٤٠٤ ! !

★ ★ ★

تابلۆی (١٠) :ـ پیتەکانی ( ك هـ ی ع ص ) ، ئەم (٥) پیتـە تەنیا لە (١) ئایەتە پیتدا کۆ بوونەتەوەو سەرجەمی ئەم (٥) پیتە لـــەو سورەتەی کە ئایەتە پیتی ئـەم (٥) پیتەیە بەم شێوەیە :ـ

ژمارەی پیتی (ك) لـە سورەتی (مریم)دا = ١٣٧
ژمارەی پیتی (هـ) لـە سورەتی (مریم)دا = ١٦٨
ژمارەی پیتی (ی) لـە سورەتی (مریم)دا = ٣٤٥
ژمارەی پیتی (ع) لـە سورەتی (مریم)دا = ١٢٢
ژمارەی پیتی (ص) لـە سورەتی (مریم)دا = ٦٢

سەرجەمەکەشیان ( ٧٩٨ ) پیتە .

وە ژمارەی (٧٩٨) دابەشی سەر ژمارەی (١٩) دەبێت بەبێ مانەوەی هیچ کەرتێك :ـ

٧٩٨ ÷ ١٩ = ٤٥

★ ★ ★

تابلۆی (١١) :ـ پیتەکانی ( أ ل م ر ) ، ئەم (٤) پیتە تەنیا لە(١) ئایەتە پیتدا بەیەکەوە هاتوون لەناو هـەر (٣٠) ئایەتـە پیتـەکاندا ، وەسەرجەمی ئەم (٤) پیتە لەو سورەتەی کە ئەم (٤) پیتە بووە بە ئایەتـــە پیتیان بەم شێوەیە :ـ

ژمارەی پیتی (أ) لـە سورەتی (الرعد)دا = ٦٢٥
ژمارەی پیتی (ل) لـە سورەتی (الرعد)دا = ٤٧٩
ژمارەی پیتی (م) لـە سورەتی (الرعد)دا = ٢٦٠
ژمارەی پیتی (ر) لـە سورەتی (الرعد)دا = ١٣٧

سەرجەمەکانیان (١٥٠١) پیتە •

وە ژمارەی (١٥٠١) بەبێ مانەوەی هیچ کەرتێك دابەشی سەر ژمارەی (١٩) دەبێت :ـ

١٥٠١ ÷ ١٩ = ٧٩

★ ★ ★

تابلۆی (١٢) :ـ پیتەکانی ( أ ل م ص ) ، ئەم (٤) پیتە تەنیا لە (١) ئایەتە پیتدا بەیەکەوە هاتوون ، وە سەرجەمی ئەم (٤) پیتە لەم سورەتەدا بەم شێوەیەیە : ـ

ژمارەی پیتی (أ) لە سورەتی (الاعراف)دا = ٢٥٧٢

ژمارەی پیتی (ل) لە سورەتی (الاعراف)دا = ١٥٢٣

ژمارەی پیتی (م) لە سورەتی (الاعراف)دا = ١١٦٥

ژمارەی پیتی (ص) لە سورەتی (الاعراف)دا = ٩٨

سەرجەمەکەشیان (٥٣٥٨) پیتە •

وە ژمارەی (٥٣٥٨) بەبێ مانەوەی هیچ کەرتێك دابەشی سەر ژمارەی (١٩) دەبێت : ـ

٥٣٥٨ ÷ ١٩ = ٢٨٢

★ ★ ★

تابلۆی (١٣) :ـ پیتەکانی ( أ ل ر ) ، ئەم (٣) پیتە لە (٦) ئایەتە پیتدا بەیەکەوە هاتوون ، وە سەرجەمی ئەم (٣) پیتە لەو سورتانەی کە ئەم (٣) پیتە لە ئایەتە پیتیانە بەم شێوەیە :ـ

| ز | سورەتەکان | ژمارەی دووبارە بوونەوەی پیتی أ | ل | ر | سەرجەمەکانیان |
|---|---|---|---|---|---|
| ١ | یونس | ١٣٥٣ | ٩١٢ | ٢٥٧ | ٢٥٢٢ |
| ٢ | هـود | ١٤٠٢ | ٧٨٨ | ٣٢٤ | ٢٥١٤ |
| ٣ | یوسف | ١٣٣٥ | ٨١٢ | ٢٥٨ | ٢٤٠٥ |
| ٤ | ابراهیم | ٥٩٤ | ٤٥٢ | ١٦٠ | ١٢٠٦ |
| ٥ | الحجر | ٥٠٣ | ٣٢٣ | ٩٩ | ٩٢٥ |
| ٦ | الرعد | | | ١٣٧ | ١٣٧ |
| | | ٥١٨٧ | ٣٢٨٧ | ١٢٣٥ | ٩٧٠٩ |

ژمارەی (٩٧٠٩) کە ژمارەی پیتەکانی ( أ ل ر ) یە لەو (٦) سورەتە کە ئەم (٣) پیتە بووە بە ئایەتە پیتیان ، ئەوا بەبێ مانەوەی هیچ کەرتێك دابەشی سەر ژمارەی (١٩) دەبێت :ـ

٥١١ = ١٩ ÷ ٩٧٠٩

★ ★ ★

تابلۆی (١٤) :ـ پیتەکانی ( ح م ) ، ( ع س ق ) ، ئەم (٥) پیتە تەنیا لە سورەتی ( الشوری )دا بەیەکەوە بونە بە ئایەتە پیت ، پیتەکانـی ( ح م ) ئایەتی یەکەمی سورەتی (الشوری)ن ، وە پیتەکانی (ع س ق) دووەم ئایەتی سورەتی (الشوری)ن ، وە سەرجەمی ئەم (٥) پیتە لـــەم سورەتەدا بەم شێوەیەی خوارەوەیە :ـ

| سورەتی | ئایەت | پیت | | ژمارە |
|---|---|---|---|---|
| سورەتی (الشوری) | ئایەتی (١) | ژمارەی پیتی (ح) | = | ٥٣ |
| | | ژمارەی پیتی (م) | = | ٣٠٨ |
| | ئایەتی (٢) | ژمارەی پیتی (ع) | = | ٩٩ |
| | | ژمارەی پیتی (س) | = | ٥٣ |
| | | ژمارەی پیتی (ق) | = | ٥٧ |

( ٥٧٠ )

وە ژمارەی (٥٧٠) بەبێ مانەوەی هیچ کەرتێك دابەشی ســـەر ژمارەی (١٩) دەبێت : ـ

٥٧٠ ÷ ١٩ = ٣٠

وە سەرجەمی پیتەکانی ئایەتی یەکەمی (الشوری) بە تەنیاش دابەشی سەر ژمارەی (١٩) دەبێت :ـ

ژمارەی پیتی (ح) لـە سورەتی (الشوری)دا = ٥٣

ژمارەی پیتی (م) لـە سورەتی (الشوری)دا = ٣٠٨

سەرجەمەکانیان (٣٦١) پیتە •

٣٦١ ÷ ١٩ = ١٩

وە هەروەها سەرجەمی پیتەکانی ئایەتە پیتی (٢) ی ( الشوری )ش بە تەنیاش دابەش سەر ژمارەی (١٩) دەبێت :ـ

ژمارەی پیتی (ع) لـە سورەتی (الشوری)دا = ٩٩
ژمارەی پیتی (س) لـە سورەتی (الشوری)دا = ٥٣
ژمارەی پیتی (ق) لـە سورەتی (الشوری)دا = ٥٧

سەرجەمەکەشیان (٢٠٩) پیتە •

٢٠٩ ÷ ١٩ = ١١

★ ★ ★

ئابەم شێوەیە قورئانی پیرۆز ئاشکرای کرد کە ئاینی ئیسلام ئاینێکی نەمرەو گومانی روخانی لێ ناکرێ !

سەر لەبەیانییەکی بەهار ، ژمارەی (١٩) سەعاتی سفری دانابۆوە ، بەڵێ ژمارەی (١٩) سەعاتی سفری بۆ بەرپا کردنی ئەم کۆدەتایە لـــە سەرلە بەیانی (١١–٤–١٩٧٢ )دا داناوە •

ژمارەی (١٩) بوو ، ئەو پاڵەوانە نەترسەی کە سەر لە بەیانـــی ( ١١–٤–١٩٧٢ ) بە بارەگای کۆنفرانسی ئەمەریکی هەڵگەراو نەمری ئەم ئاینە پاکەو ئەم قورئانە پیرۆزەی تۆمار کرد لەژێر ژمارەی (٢٧٣٨٦)دا !

ژمارەی (١٩) هەموو تابلۆکانی بە گوێی کۆنفرانسی ئەمەریکیدا ڕاگەیاندو هەموو تابلۆکانی (٢٢) لە ژێر ژمارەی (٢٧٣٨٦)دا لە رۆژی ( ١١–٤–١٩٧٢ )دا تۆمار کرد لە کۆنفرانس دا !

★ ★ ★

مژدە بۆ خوشك‌و براکانم کە کیشوەری مادیـــەت‌و وجودیـــەت ، کیشوەری ماسۆنیی‌و زایۆنیزم،وا لەژێر چەپۆکی تورەی زانیاریدا دەناڵێنێت‌و

---

٢٢– بروانە (٣) خشتەکەی ( کۆتایی ) ، ئەم (٣) خشتەیە بووکە ( د• رەشاد خەلیفە ) لە کۆنفرانسی ئەمەریکی تۆماری کرد •

کەوتە پەلە قاژێ ، قورئانی پیرۆزیش رۆژ نیە کە خونچەو چرۆیی نوێ دەرنەکاتو نەگەشێتەوەو ئەمەش راستییەکی بەڵگە نەویستە لەلایەن رۆشنبیرانەوە ٠

★ ★ ★

تابلۆی (١٥) :ــ پیتەکانی ( ح ٠ م ) ، ئەم (٢) پیتە لە(٧) ئایەتــە پیــتدا بەیەکەوە هاتــوون ، وسەرجــەمی ئــەم (٢) پیتــە لەهــەر (٧) سورەتەکەدا بەم شێوەیەی خوارەوەیە :ــ

| ز | سورەتەکان | ژمارەی دووبارە بوونەوەی پیتی | | سەرجەمەکانیان |
|---|---|---|---|---|
| | | ح | م | |
| ١ | غافر | ٦٤ | ٣٨٩ | ٤٥٣ |
| ٢ | فصلت | ٥٨ | ٢٧٦ | ٣٣٤ |
| ٣ | الشوری (١) | ٥٣ | ٣٠٨ | ٣٦١ |
| ٤ | الزخرف | ٤٠ | ٣١٧ | ٣٦٢ |
| ٥ | الدخان | ١٦ | ١٤٥ | ١٦١ |
| ٦ | الجاثیــة | ٣١ | ٢٠٠ | ٢٣١ |
| ٧ | الاحقاف | ٣٧ | ٢٢٧ | ٢٦٤ |
| | | ٣٠٤ | ١٨٦٢ | ٢١٦٦ |

بەڵێ ژمارەی (٢١٦٦) دا بەشی سەر ژمارەی (١٩) دەبێت بەبــێ مانەوەی هیچ کەرتێك :ــ

٢١٦٦ ÷ ١٩ = ١١٤

★ ★ ★

تابلۆی (١٦) : ـ پیتەکانی ( ط س م ) ، ئەم (٣) پیتە بەم شێوەیەی خوارەوە لە ئایەتە پیتەکاندا بەشداری کردوە :ـ

پیتی (ط) لە (٤) ئایەتە پیت دا هاتووە •

پیتی (س) لە (٥) ئایەتە پیت دا هاتووە •

پیتی (م) لە (٢) ئایەتە پیت دا هاتووە (٢٣) •

وە سەرجەمی ئەم پیتانە لەو سورەتانەی کە ئەم پیتانە لە ئایەتە پیتیاندا هاتوون بەم شێوەیەیە :ـ

| ز | سورەتەکان | ژمارەی دووبارە بوونەوەی پیتی ط | س | م | سەرجەمەکانیان |
|---|---|---|---|---|---|
| ١ | طـه | ٢٨ | | | ٢٨ |
| ٢ | الشعراء | ٣٣ | ٩٣ | ٤٨٩ | ٦١٥ |
| ٣ | النمل | ٢٧ | ٩٣ | | ١٢٠ |
| ٤ | القصص | ١٩ | ١٠٠ | ٤٦١ | ٥٨٠ |
| ٥ | يس | | ٤٨ | | ٤٨ |
| ٦ | الشورى | | ٥٣ | | ٥٣ |
| | | ١٠٧ | ٣٨٧ | ٩٥٠ | ١٤٤٤ |

٢٣ـ پیتی (م) لە (١٧) ئایەتە پیتدا هاتووە ، بەڵام لەگەڵ پیتەکانی ( ط س )دا تەنیا (٢) جار هاتووە ! بۆ روون کردنەوەیەو بەس •

بەڵێ ، سەرجەمی ئەم (٣) پیتە لەم سورەتانەی کە باسمان کــرد (١٤٤٤) پیتە ، وە ژمارەی (١٤٤٤) بەبێ مانەوەی هیچ کەرتێك دابەشی سەر ژمارەی (١٩) دەبێت :ـ

١٤٤٤ ÷ ١٩ = ٧٦

★ ★ ★

تابلۆی (١٧) :ـ پیتەکانی (ط س ) ، ئـەم (٢) پیتە بەم شێوەیەی خوارەوە هاتووە :ـ

پیتی (ط) لە ئایەتە پیتی (٤) سورەتدا هاتووە •

پیتی (س) لە ئایەتە پیتی (٥) سورەتدا هاتووە •

وە سەرجەمەکەشیان بەم شێوەیە :ـ

| ز | سورەتەکان | ژمارەی دووبارە بوونەوەی پیتی ط | ژمارەی دووبارە بوونەوەی پیتی س | سەرجەمەکانیان |
|---|---|---|---|---|
| ١ | طـه | ٢٨ | | ٢٨ |
| ٢ | الشعراء | ٣٣ | ٩٣ | ١٢٦ |
| ٣ | النمل | ٢٧ | ٩٣ | ١٢٠ |
| ٤ | القصص | ١٩ | ١٠٠ | ١١٩ |
| ٥ | يس | | ٤٨ | ٤٨ |
| ٦ | الشورى | | ٥٣ | ٥٣ |
| | | ١٠٧ | ٢٩٧ | ٤٩٤ |

ژمارەی (٤٩٤) دابەشی سەر ژمارەی (١٩) دەبێت بەبێ مانەوەی هیچ کەرتێك :ـ

٤٩٤ ÷ ١٩ = ٢٦

★ ★ ★

تابلۆی (١٨) :ـ پیتەکانی ( ط هـ ) ، ئەم (٢) پیتە لە (١) سورەتدا بەیەکەوە هاتوون ، وە سەرجەمی ئەم (٢) پیتە لەو سورەتەی کە ئەم (٢) پیتە بەیەکەوە بونە بە ئایەتە پیتی بەم شێوەیە :ـ

ژمارەی پیتی (ط) لە سورەتی (طـه)دا = ٢٨
ژمارەی پیتی (هـ) لە سورەتی (طـه)دا = ٣١٤

سەرجەمەکەشیان (٣٤٢) پیتە •

وە ژمارەی (٣٤٢) بەبێ مانەوەی هیچ کەرتێك دابەشی سەر ژمارەی (١٩) دەبێت : ـ

٣٤٢ ÷ ١٩ = ١٨

★ ★ ★

تابلۆی (١٩) :ـ پیتەکانی ( ی س ) ، ئەم (٢) پیتە تەنیا (١) جار بەیەکەوە هاتوون ، وە سەرجەمەکەشیان لەم سورەتەی کە ئەم (٢) پیتە بووە بە ئایەتە پیت بەم شێوەیە :ـ

ژمارەی پیتی (ی) لە سورەتی (یس) دا = ٢٣٧
ژمارەی پیتی (س) لە سورەتی (یس) دا = ٤٨

سەرجەمەکەشیان (٢٨٥) پیتە •

وە ژمارەی (٢٨٥) بەبێ مانەوەی هیچ کەرتێك دابەشی سەر

ژمارەی (١٩) دەبێت :ـ

١٥ = ١٩ ÷ ٢٨٥

★ ★ ★

تابلۆی (٢٠) :ـ پیتی (ص) ، ئەم پیتە تەنیا لە (٣) ئایەتە پیتدا هاتووە ، وە سەرجەمی ئەم پیتە لەو (٣) سورەتەی کە ئەم پیتە بووە بە ئایەتە پیتیان بەم شێوەیە : ـ

ژمارەی پیتی (ص) لە سورەتی ( الاعراف) دا = ٩٨
ژمارەی پیتی (ص) لەسورەتی ( مریـم ) دا = ٢٦
ژمارەی پیتی (ص) لەسورەتی ( ص ) دا = ٢٨

سەرجەمەکانیشیان (١٥٢) پیتە •

وە ژمارەی (١٥٢) بەبێ مانەوەی هیچ کەرتێك دابەشی سـەر ژمارەی (١٩) دەبێت :ـ

٨ = ١٩ ÷ ١٥٢

★ ★ ★

تابلۆی (٢١) :ـ پیتی (ق) ، ئەم پیتە تەنیا لە (٣) ئایەتە پیتدا بەشداری کردوە ، وە سەرجەمی ئەم پیتە لەو (٢) سورەتەی کە پیتی (ق) لە ئایەتە پیتیانە بەم شێوەیە :ـ

ژمارەی پیتی (ق) لە سورەتی ( الشوری ) دا = ٥٧
ژمارەی پیتی (ق) لە سورەتی ( ق ) دا = ٥٧

سەرجەمەکانیشیان (١١٤) پیتە •

وه ژماره‌ی (١١٤) به‌بێ مانه‌وه‌ی هیچ که‌رتێك دابه‌شی سه‌ر ژماره‌ی (١٩) ده‌بێت :ـ

١١٤ ÷ ١٩ = ٦

★ ★ ★

خوشك وبراكانم :ـ ئه‌و تابلۆیانه‌ی كه یه‌ك له دوای یه‌ك به‌بێ ده‌نگی دێن‌و وون ده‌بن به‌رهه‌می كۆمپانیای رێكه‌وت نین ، به‌ڵكو ئه‌م تابلۆیانه نیشانه‌ی نه‌مریی قورئانی پیرۆزن ، سه‌یر كه ! له سوره‌تێكی وه‌ك سوره‌تی (ق)دا یا (الشوری)دا له هه‌ر یه‌كێكیان پیتی (ق) (٥٦) جار دووباره بۆته‌وه ، به‌ڵێ جگه له پیتی (ق) كه له ئایه‌ته پیته‌كه‌یه ، ژماره‌ی پیتی (ق) له سوره‌ته‌كه‌دا (٥٦) پیته ، وه ژماره‌ی (٥٦) دابه‌شی سه‌ر ژماره‌ی (١٩) نابێت به‌بێ كه‌رت ! ، به‌ڵام خوای گه‌وره پیتێكی تری (ق)ی كردوه ، به ئایه‌ته پیت ، له‌م سوره‌ته‌دا ، تاكو ژماره‌ی (ق) له‌م سوره‌ته‌دا ببێته (٥٧) پیت ، چونكه ژماره‌ی (٥٧) دابه‌شی سه‌ر ژماره‌ی (١٩) ده‌بێت به‌بێ مانه‌وه‌ی هیچ كه‌رتێك :ـ

٥٧ ÷ ١٩ = ٣

★ ★ ★

ئه‌مه له‌لایه‌ك له‌لایه‌كی تره‌وه چیرۆكێكی زۆر سه‌ر سوڕێنه هه‌یه له‌نێوان پیتی (ق)و نه‌ته‌وه‌ی (لوت) كه ئامێری ئه‌له‌كترونی بۆی گێراینه‌وه ، خوای گه‌وره له قورئانی پیرۆزدا (١٢) جار ناوی ( قه‌ومی لوتی ) ( قوم لوط ) هێناوه ، به‌ڵام به شێوه‌یه‌كی زۆر سه‌یر ، له (١١) ئایه‌تدا به ( قوم لوط هاتووه ( قه‌ومی لوت ) به‌لام له‌جاری (١٢)مین‌دا به (اخوان لوط ) هاتووه ، به‌ڵێ له سوره‌تی (ق) دا له ئایه‌تی (١٣) دا

به ( اخوان لوط ) هاتووه ، لێرەدا ئامێری ئەلەکترونی سەری سورماوە، بۆچی لە (١١) شوێن دا ( قوم لوط ) (٢٤) ە ، کەچی لە سورەتی (ق) دا (اخوان لوط) ە !؟

بەڵێ ، لە وەڵامی ئەم پرسیارەدا گەورەیی‌و مەزنی قورئانی پیرۆز خۆی دەردەخات ، لە وەڵامی ئەم پرسیارەدا ، بەرهەمەکەی ( دکتۆر رەشاد ) شیرین‌تر و بە بۆن‌تر دەبن ، بەڵێ ، ئامێری ئەلەکترونی لــە دوای ئەوەی کە بیرێکی زۆری کردەوەو سەری هەڵبڕی‌و بەناچاریەوە ووتــی : ــ

هەموو ووشەو پیتێك لەم قورئانە پیرۆزەدا بە یاسا دانراوەو بەبــێ هۆ دانەنراوە ، کاتێ خوای گەورە لە سورەتی (ق)دا ناوی (قەومی لوت) بە (اخوان لوط) دەبات ، چونکە ئەگەر لەم ئایەتەش‌دا وەکـــو (١١) ئایەتەکانی‌تر بە (قوم لوط) هاتبا ئەوا پیتی (ق) لە سورەتی (ق)دا دەبوو بە (٥٨) (ق) ، وە ژمارەی ( ٥٨) دابەشی سەر ژمارەی (١٩) نەدەبــوو بەبێ کەرت !

بەڵێ خوای گەورە لە سورەتی (ق)دا لە جیاتی ( قوم لوط )دا (اخوان لوط ) هێناوە تاوەکو ئەم تابلۆیە بە زیندوویی بمێنێتەوەو هــەردەم بەڵگەی دەسەڵاتی بێ سنووری خوای گەورەمان بۆ بخاتە ڕوو •

( ولله العــزة جميعـــا )

★ ★ ★

---

٢٤ـ ئەم (١١) جارەی کە (قوم لوط) هاتووە لەم سورەتانەیە :ــ ( ١٣ ـ قمر ) ( ٢٨ ـ العنكبوت ) (٥٤ ـ ٥٦ ـ النمل ) (١٢ ـ ص) ( ١٦٠ ـ الشعراء ) (٧٠ ـ ٧٤ ـ ٨٩ ـ الهود ) ( ٤٣ ـ الحج) ( ٨٠ ـ الاعراف ) •

تابلۆی (٢٢) :ـ پیتی (ن) ، ئەم پیتە تەنیا (١) جار لەگەل ئایەتە پیتەکاندا بەشداری کردوە ، ئەویش لە ئایەتە پیتی سورەتی (القلم)دا بووە ئایەتە پیت ، وە سەرجەمی ئەم پیتە لە سورەتی (القلم)دا (١٣٢) پیتە ، وە ژمارەی (١٣٢) دابەشی سەر ژمارەی (١٩) نابێت بەبێ مانەوەی کەرت ، بۆیە ، خوای گەورە ، پیتێکی تری (ن)ی هێناوەو بە تەنیا کردوویەتی بە ئایەتە پیتی سورەتی (القلم) ، تاکو ژمارەی پیتی (ن) لە سورەتی (القلم) دا ببێتە (١٣٣) پیت، چونکە ژمارەی (١٣٣) دابەشی سەر ژمارەی (١٩) دەبێت بەبێ مانەوەی هیچ کەرتێك :ـ

١٣٣ ÷ ١٩ = ٧

★ ★ ★

لە دوای ئەوەی سەیری ئەم (٢٢) تابلۆ نەمرەمان کرد ، ئێستاش چەند تابلۆیەکی ترمان پێش کەش دەکەین کە بەشێوەیەکی قوولتر لەبارەی ئایەتە پیتەکانەوە دە دوێن ، بەو نیازەی ئەم تابلۆیانە سودی موسولمانانی هەبێت و گرێ کۆرەی دڵیان لە بارەی ئایەتە پیتەکانەوە بکاتەوە •

★ ★ ★

تابلۆی (٢٣) :ـ پیتەکانی ( ط ، هـ ) (٢٥) ئەم (٢) پیتە بەم شێوەیەی خوارەوە لە ئایەتە پیتەکاندا هاتووە :ـ

پیتی (ط) تەنیا لە (٤) ئایەتە پیتدا هاتووە ، وە پیتی (هـ) تەنیا لە (٢) ئایەتە پیتدا هاتووە ، وە سەرجەمی ئەم (٢) پیتە لەو سورەتانەی کە ئەم پیتانە لە ئایەتە پیتیانە بەم شێوەیەیە :ـ

---

٢٥ـ بۆ روون کردنەوە :ـ لە تابلۆی (١٨)دا تەنیا باسی پیتەکانی ( ط هـ ) مان کرد لە سورەتی (طـه)دا ، بەلام لەم تابلۆیەدا باسی پیتەکانی ( ط هـ ) دەکەین لەهەر (٣٠) ئایەتە پیتەکاندا •

| ز | سوره‌ته‌كان | ژماره‌ی دووباره بوونه‌وه‌ی پیتی ط | ژماره‌ی دووباره بوونه‌وه‌ی پیتی هـ | سه‌رجه‌مه‌كانیان |
|---|---|---|---|---|
| ١ | مريم | | ١٦٨ | ١٦٨ |
| ٢ | طـه | ٢٨ | ٣١٤ | ٣٤٢ |
| ٣ | الشعراء | ٣٣ | | ٣٣ |
| ٤ | القصص | ٢٧ | | ٢٧ |
| ٥ | العنكبوت | ١٩ | | ١٩ |
| | | ١٠٧ | ٤٨٢ | ٥٨٩ |

سه‌رجه‌می ئه‌م (٢) پیته له‌و سوره‌تانه‌ی كه باسمان كرد ده‌كاته (٥٨٩) پیت ، وه ژماره‌ی (٥٨٩) به‌بێ مانه‌وه‌ی هیچ كه‌رتێك دابه‌شی سه‌ر ژماره‌ی (١٩) ده‌بێت :ــ

٥٨٩ ÷ ١٩ = ٣١

★ ★ ★

تابلۆی (٢٤) :ــ پیته‌كانی ( ی ، س ) (٢٦) ، پیتی (ی) لــه (٢) ئایه‌ته پیت‌دا به‌شداری كردوه ، به‌لام پیتی (س) لــه (٥) ئایه‌تــه پیت‌دا به‌شداری كردوه سه‌رجه‌می ئه‌م(٢) پیته له‌م سوره‌تانه‌ی كه ئه‌م (٢) پیته له ئایه‌ته پیتیانه به‌م شێوه‌یه :ــ

| ز | سورەتەکان | ژمارەی دووبارە بوونەوەی پیتی ی | س | سەرجەمەکانیان |
|---|---|---|---|---|
| ١ | مريم | ٣٤٥ | | ٣٤٥ |
| ٢ | الشعراء | | ٩٣ | ٩٣ |
| ٣ | النمل | | ٩٣ | ٩٣ |
| ٤ | القصص | | ١٠٠ | ١٠٠ |
| ٥ | يس | ٢٣٧ | ٤٨ | ٢٨٥ |
| ٦ | الشورى (٢) | | ٥٣ | ٥٣ |
| | | ٥٨٢ | ٣٨٧ | ٩٦٩ |

وە ژمارەی (٩٦٩) بەبێ مانەوەی هیچ کەرتێك دابەشی سـەر ژمارەی (١٩) دەبێت :ـ

٩٦٩ ÷ ١٩ = ٥١

تابلۆی (٢٥) :ـ پیتەکانی ( ع س ق ) ، ئەم (٣) پیتە بەم شێوەیەی خوارەوە لە ئایەتە پیتەکاندا دووبارە بۆتەوە :ـ

---

٢٦ـ لە تابلۆی (١٩)دا تەنیا باسی پیتەکانی (ی س) مان کرد لە سورەتی (يس)دا وبەس ، بەڵام لەم بەشەدا باسی پیتەکانی ( ی س) دەکەین لە هەر (٣٠) ئایەتە پیتدا •

| ز | سورەتەکان | ژمارەی دووبارە بوونەوەی پیتی ع | س | ق | سەرجەمەکانیان |
|---|---|---|---|---|---|
| ١ | مريم | ١٢٢ | | | ١٢٢ |
| ٢ | الشعراء | | ٩٣ | | ٩٣ |
| ٣ | النمل | | ٩٣ | | ٩٣ |
| ٤ | القصص | | ١٠٠ | | ١٠٠ |
| ٥ | يس | | ٤٨ | | ٤٨ |
| ٦ | الشورى (٢) | ٩٩ | ٥٣ | ٥٧ | ٢٠٩ |
| ٧ | ق | | | ٥٧ | ٥٧ |
| | | ٢٢١ | ٣٨٧ | ١١٤ | ٧٢٢ |

کەواتە پیتی (ع) لەو (٢) سورەتەی کە لە ئایەتە پیتەکەیاندا هاتووە سەرجەمەکەی (٢٢١) پیتە ، وە پیتی (س) لەو (٥) سورەتەی کە لە ئایەتە پیتەکەیاندا هاتووە سەرجەمەکەی (٣٨٧) پیتە ، وە پیتی (ق) لەو (٢) سورەتەی کە لە ئایەتە پیتەکەیاندا هاتووە سەرجەمەکەی (١١٤) پیتە ، وە سەرجەمی ئەم (٣) پیتە لە سورەتەکانی کەدیارمان خست (٧٢٢) پیتە ، ژمارەی (٧٢٢) دابەشی سەر ژمارەی (١٩) دەبێت بەبێ مانەوەی هیچ کەرتێك : ـ

٧٢٢ ÷ ١٩ = ٣٨

★ ★ ★

تابلۆی (٢٦) :ـ پیتەکانی ( ح م ) ، ئەم (٢) پیتە بەم شێوەیەی خوارەوە دووبارە بۆتەوە : ـ

پیتی (ح) لە (٧) ئایەتە پیت دا هاتووە ٠
پیتی (م) لە (١٧) ئایەتە پیت دا هاتووە ٠
وە سەرجەمی ئەم (٢) پیتە لەو سورەتانەی کە لە ئایەتە پیتەکانیاندا هاتووە بەم شێوەیە :ـ

| ز | سورەتەکان | ژمارەی دووبارە بوونەوەی پیتی ح | م | سەرجەمەکانیان |
|---|---|---|---|---|
| ١ | البقرة | | ٢١٩٥ | ٢١٩٥ |
| ٢ | الـعمران | | ١٢٥١ | ١٢٥١ |
| ٣ | الاعراف | | ١١٦٥ | ١١٦٥ |
| ٤ | الرعد | | ٢٦٠ | ٢٦٠ |
| ٥ | الشعراء | | ٤٨٩ | ٤٨٩ |
| ٦ | القصص | | ٤٦١ | ٤٦١ |
| ٧ | العنكبوت | | ٣٤٧ | ٣٤٧ |
| ٨ | الروم | | ٣١٨ | ٣١٨ |
| ٩ | لقمان | | ١٧٧ | ١٧٧ |
| ١٠ | السجدة | | ١٥٨ | ١٥٨ |
| ١١ | غافر | ٦٤ | ٣٨٩ | ٤٥٣ |
| ١٢ | فصلت | ٥٨ | ٢٧٦ | ٣٣٤ |
| ١٣ | الشورى (١) | ٥٣ | ٣٠٨ | ٣٦١ |
| ١٤ | الزخرف | ٤٥ | ٣١٧ | ٣٦٢ |
| ١٥ | الدخان | ١٦ | ١٤٥ | ١٦١ |
| ١٦ | الجاثية | ٣١ | ٢٠٠ | ٢٣١ |
| ١٧ | الاحقاف | ٣٧ | ٢٢٧ | ٢٦٤ |
| | | ٣٠٤ | ٨٦٨٣ | ٨٩٨٧ |

وە ژمارەی (٨٩٨٧) بەبێ مانەوەی هیچ کەرتێك دابەشی سەر ژمارەی (١٩) دەبێت :ـ

٨٩٨٧ ÷ ١٩ = ٤٧٣

★ ★ ★

وردەکاری‌ی خوای گەورە تەنیا قورئانی پیرۆزی نەگرتۆتەوە، بەلکو ئەگەر سەیری ئەم بوونەوەرە بکەین ، خۆی لە خۆی‌دا جیهانێکی سەر سورهێنەرە .

(گون) کە ئامێرەکە لە ئامێرەکانی لەشی ئادەمیزاد ، گەلێك بەوردی کاری خۆی رادەپەرێنێت ، بەلاّم ئەوەی کەجێ‌ی سەرسوڕمانە ئەوەیە ، بۆچی ئەم ئامێرە وەکو ئامێرەکانی‌تر بۆ بەڵگە وەکو (دل) یا (چاو) یا (زەرداو) .... هتد ، لە ژوورەوەی (سنگ) یا (سگ) یا (سەر) دانیە بەڵکو لە دەرەوەیە ؟ !

لە وەلاّمی ئەم پرسیارەدا راستی شەق دەدا لە درۆ ، لە وەلاّمی ئەم پرسیارەدا ، بێ باوەڕانی جیهان ، ئەوانەی دەیانەوێت تەنیا ، بە ووشە بریقەدارەکان ، گەنجەکانمان وا تێبگەیەنن ، کە گوایە ئەم بوونەوەرە بە ئەستێرەکانو گازەکانیەوە ، بە مادە شل‌و ڕەقەکانیەوە ، بەگیان‌لەبەرو بێ‌گیانەکانەوە بە ... بە ... هتد ، لە کۆمپانیای (رێکەوت) دروست بووە ، بەلێ بەرانبەر ئەم تاکە پرسیارەدا ناتوانن بوەستن ، بۆچی ئامێری (گون) لە دەرەوەیە ؟ !

بەلێ ، بەر لە (٥٠) سالّ ، ئادەمیـزاد ، وای دەزانی کە ئـەم کارە کارێکی هەلّەیە پێویستی بە چارەسەری ( عەمەلیات ) هەیـە کە بخرێتـە ژوورەوەی ( سگ ) !

بەڵام زانیاری نوێ لەم سەدەیەدا پەردەی لەسەر ڕووی ئەم ڕاستیەش لاداو گووتی :ـ

ئامێری ( گون ) کۆمپانیای ( گیانلەبەرەمانەویەکانە) ئەم گیان لەبەرانە لە سەرەتادا لە گون دروست دەبن لە پاشان دەچنە شوێنی دیاری کراو ژوورەوەی لەشدا ، وە زاناکان گوتیان هەموو ئامێرەکانی لەش هەر لە ( سیەکان ) و ( گەدا ) تاکو (جگەر) و (چاو) ٠٠٠و٠٠٠و هتد ، کاری خۆیان لەپلەی گەرمی (٣٧) دا زۆر بەڕێکی ڕادەپەڕێنن ، بەڵام ئامێری (گون) کە کاری سەرشانی دروست کردنی ئەم (گیان لەبەرە مەنەویانەیە) ناتوانێت لە پلەی گەرمی (٣٧) دا کاری خۆی جێبەجێ بکات ، چونکە ئەم (گیان لەبەرانە) کە دروست دەکات یا بابلێین ( کە تیایدا دروست دەبێت ) پێویستی بە پلـەی گەرمی (٣٠) یا (٣٣) هەیـەو بەس ، نـەك پلەی گەرمی (٣٧) ! ، بۆیە خوای گەورە ، ئەم ئامێرەی ، لە دەرەوە داناوە وەکو (فرێزەرێك) کە پلەی گەرمی (٣٢) ە ، چونکـە لەپلـەی گەرمی (٣٢) دا ئەم گیان لەبەرانە (گیان لەبەرە مەنەویەکان) دروسـت دەبن‌و بەس ، خۆ ئەگەر پلەی گـەرمی ئامێری (گون) بـوو بـە (٣٧) ئەوا (گیان لەبەرە مەنەویەکان ) دروست نابن ! ، چونکە ئەم پلەیە زۆر گەرمە بەلای ئەوانەوەو بۆ دروست بونیان ناشێت !

بەڵێ بەم شێوەیە ، ئەم بوونەوەرە ، بووە بە مامۆستاو بووە یـە قوتابخانە ، کە بڕوانامەی تاکی‌و بەرزیی خوای گەورە دەداتە ئـەو ئادەمیزادە ژیرانەی کە هەست بە ڕاستی دەکـەن‌و خـۆیان لـە ڕاستی ناشێرنەوە !

★ ★ ★

ئابلۆی (٢٧) :ـ پیتەکانی ( أ ل م ) ، ئەم (٣) پیتە بەم شێوەیە لە ئایەتە پیتەکاندا بەشداریان کردووە :ـ

پیتی (أ) لە (١٣) ئایەتە پیتدا بەشداری کردوە •

پیتی (ل) لە (١٣) ئایەتە پیتدا بەشداری کردوە •

پیتی (م) لە (١٧) ئایەتە پیتدا بەشداری کردوە •

وە سەرجەمی ئەم (٣) پیتە ( أ ل م ) لەو سورەتانەی کە ئایەتی پیتیان ئەم پیتانەیان تیایە بەم شێوەیە :ـ

| ز | سورەتەکان | ژمارەی دووبارە بوونەوەی پیتی أ | ل | م | سەرجەمەکانیان |
|---|---|---|---|---|---|
| ١ | البقرة | ٤٥٩٢ | ٣٢٠٤ | ٢١٩٥ | ٩٩٩١ |
| ٢ | ال عمران | ٢٥٧٨ | ١٨٨٥ | ١٢٥١ | ٥٧١٤ |
| ٣ | الاعراف | ٢٥٧٢ | ١٥٢٣ | ١١٦٥ | ٥٢٦٠ |
| ٤ | یونس | ١٣٥٣ | ٩١٢ | | ٢٢٦٥ |
| ٥ | هـود | ١٤٠٢ | ٧٨٨ | | ٢١٩٠ |
| ٦ | یوسف | ١٣٣٥ | ٨١٢ | | ٢١٤٧ |
| ٧ | الرعد | ٦٢٥ | ٤٧٩ | ٢٦٠ | ١٣٧٤ |
| ٨ | ابراهیم | ٥٩٣ | ٤٥٢ | | ١٠٤٦ |
| ٩ | الحجر | ٥٠٤ | ٣٢٣ | | ٨٢٦ |
| ١٠ | الشعراء | | | ٤٨٩ | ٤٨٩ |

| | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| ١١ | القصص | | | ٤٦١ | ٤٦١ |
| ١٢ | العنكبوت | ٧٨٤ | ٥٥٤ | ٣٤٧ | ١٤٨٥ |
| ١٣ | الروم | ٥٤٥ | ٣٩٦ | ٣١٨ | ١٢٥٩ |
| ١٤ | لقمان | ٣٩٨ | ٢٩٨ | ١٧٧ | ٨٧٣ |
| ١٥ | السجدة | ٢٦٨ | ١٥٤ | ١٥٨ | ٥٨٠ |
| ١٦ | غافـر | | | ٣٨٩ | ٣٨٩ |
| ١٧ | فصلت | | | ٢٧٦ | ٢٧٦ |
| ١٨ | الشورى (١) | | | ٣٠٨ | ٣٠٨ |
| ١٩ | الزخرف | | | ٣١٧ | ٣١٧ |
| ٢٠ | الدخان | | | ١٤٥ | ١٤٥ |
| ٢١ | الجاثية | | | ٢٠٠ | ٢٠٠ |
| ٢٢ | الاحقاف | | | ٢٢٧ | ٢٢٧ |
| | | ١٧٤٩٩ | ١١٧٨٠ | ٨٦٨٣ | ٣٧٩٦٢ |

وه ژمارەی ( ٣٧٩٦٢) بەبێ مانەوەی هیچ کەرتێك دابەشی سەر ژمارەی (١٩) دەبێت : ـ

٣٧٩٦٢ ÷ ١٩ = ١٩٩٨

★ ★ ★

تابلۆی (٢٨) :ـ پیتەکانی ( أ ل ر ) ، ئەم (٣) پیتە بەم شێوەیەی خوارەوە دووبارە بۆتەوە :ـ

| ز | سورەتەکان | ژمارەی دووبارە بوونەوەی پیتی أ | ل | ر | سەرجەمەکانیان |
|---|---|---|---|---|---|
| ١ | البقرة | ٤٥٩٢ | ٣٢٠٤ | | ٧٧٩٦ |
| ٢ | آل‌عمران | ٢٥٧٨ | ١٨٨٥ | | ٤٤٦٣ |
| ٣ | الاعراف | ٢٥٧٢ | ١٥٢٣ | | ٤٠٩٥ |
| ٤ | یونس | ١٣٥٣ | ٩١٢ | ٢٥٧ | ٢٥٢٢ |
| ٥ | هـود | ١٤٠٢ | ٧٨٨ | ٣٢٤ | ٢٥١٤ |
| ٦ | یوسف | ١٣٣٥ | ٨١٢ | ٢٥٨ | ٢٤٠٥ |
| ٧ | الرعد | ٦٢٥ | ٤٧٩ | ١٣٧ | ١٢٤١ |
| ٨ | ابراهیم | ٥٩٤ | ٤٥٢ | ١٦٠ | ١٢٠٦ |
| ٩ | الحجر | ٥٠٣ | ٣٢٣ | ٩٩ | ٩٢٥ |
| ١٠ | العنکبوت | ٧٨٤ | ٥٥٤ | | ١٣٣٧ |
| ١١ | الروم | ٥٤٥ | ٣٩٦ | | ٩٤١ |
| ١٢ | لقمان | ٣٤٨ | ٢٩٨ | | ٦٤٦ |
| ١٣ | السجدة | ٢٦٨ | ١٥٤ | | ٤٢٢ |
| | | ١٧٤٩٩ | ١١٧٨٠ | ١٢٣٥ | ٣٠٥١٤ |

وە ژمارەی (٣٠٥١٤) بەبێ مانەوەی هیچ کەرتێك دابەشی سەر ژمارەی (١٩) دەبێت :ـ

٣٠١٥٤ ÷ ١٩ = ١٦٠٦

★ ★ ★

تابلۆی (٢٩) :ــ پیته‌کانی ( ط س م ) ، ئه‌م (٣) پیته به‌م شـــێوه‌یه‌ی خواره‌وه دووباره ۆته‌وه له ئایه‌ته پیته‌کاندا :ــ

پیتی (ط) له (٤) ئایه‌ته پیت‌دا هاتووه •

پیتی (س) له (٤) ئایه‌ته پیت‌دا هاتووه •

پیتی (م) له (١٧) ئایه‌ته پیت‌دا هاتووه •

وه سه‌رجه‌مه‌کانیان له‌م سوره‌تانه‌ی که ئایه‌ته پیتیان پیتی (ط) یـا (س) یا (م)ی تیایه ئه‌م (٣) پیته به‌م شێوه‌یه‌ی خواره‌وه دووباره بۆته‌وه :ــ

| ز | سوره‌ته‌کان | ژماره‌ی دووباره بوونه‌وه‌ی پیتی | | | سه‌رجه‌مه‌کانیان |
|---|---|---|---|---|---|
| | | ط | س | م | |
| ١ | البقرة | | | ٢١٩٥ | ٢١٩٥ |
| ٢ | ال‌عمران | | | ١٢٥١ | ١٢٥١ |
| ٣ | الاعراف | | | ١١٦٥ | ١١٦٥ |
| ٤ | الرعد | | | ٢٦٠ | ٢٦٠ |
| ٥ | طـه | ٢٨ | | | ٢٨ |
| ٦ | الشعراء | ٣٣ | ٩٣ | ٤٨٩ | ٦١٥ |
| ٧ | النمـل | ٢٧ | ٩٣ | | ١٢٠ |
| ٨ | القصص | ١٩ | ١٠٠ | ٤٦١ | ٥٨٠ |
| ٩ | العنكبوت | | | ٣٤٧ | ٣٤٧ |
| ١٠ | الروم | | | ٣١٨ | ٣١٨ |
| ١١ | لقمان | | | ١٧٧ | ١٧٧ |
| ١٢ | السجدة | | | ١٥٨ | ١٥٨ |
| ١٣ | يس | | ٤٨ | | ٤٨ |

| | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| ١٤ | غافــر | | | ٣٨٩ | ٣٨٩ |
| ١٥ | فصلت | | | ٢٧٦ | ٢٧٦ |
| ١٦ | الشورى (١) | | | ٣٠٨ | ٣٠٨ |
| ١٧ | الزخرف | | | ٣١٧ | ٣١٧ |
| ١٨ | الدخان | | | ١٤٥ | ١٤٥ |
| ١٩ | الجاثية | | | ٢٠٠ | ٢٠٠ |
| ٢٠ | الاحقاف | | | ٢٢٧ | ٢٢٧ |
| | | ١٠٧ | ٣٨٧ | ٨٦٨٣ | ٩١٧٧ |

وه ژمارەی (٩١٧٧) دابەشی سەر ژمارەی (١٩) دەبێت بەبــێ مانەوەی هیچ کەرتێك :ــ

٩١٧٧ ÷ ١٩ = ٤٨٣

★ ★ ★

تابلۆی (٣٠) :ــ پیتەکانی ( أ ل م ر ) ، ئــەم (٤) پیتە بــەم شێوەیەی خوارەوە دووبارە بۆتەوە لە ئایەتە پیتەکاندا :ــ

پیتی (أ) لە (١٣) ئایەتە پیتدا بەشداری کردووە •

پیتی (ل) لە (١٣) ئایەتە پیتدا بەشداری کردووە •

پیتی (م) لە (١٧) ئایەتە پیتدا بەشداری کردووە •

پیتی (ر) لە (٦) ئایەتە پیتدا بەشداری کردووە •

وە سەرجەمەکەیان بەم شێوەیە :ــ

| ز | سوره‌ته‌كان | أ | ل | م | ر | سه‌رجه‌مه كانيان |
|---|---|---|---|---|---|---|
| | | **ژماره‌ی دووباره بوونه‌وه‌ی پيتی** | | | | |
| ١ | البقرة | ٤٥٩٢ | ٣٢٠٤ | ٢١٩٥ | | ٩٩٩١ |
| ٢ | آل‌عمران | ٢٥٧٨ | ١٨٨٥ | ١٢٥١ | | ٥٧١٤ |
| ٣ | الاعراف | ٢٥٧٢ | ١٥٢٣ | ١١٦٥ | | ٥٢٦٠ |
| ٤ | يونس | ١٣٥٣ | ٩١٢ | | ٢٥٧ | ٢٥٢٢ |
| ٥ | هـود | ١٤٠٢ | ٧٨٨ | | ٣٢٤ | ٢٥١٤ |
| ٦ | يوسف | ١٣٣٥ | ٨١٢ | | ٢٥٨ | ٢٤٠٥ |
| ٧ | الرعد | ٦٢٥ | ٤٧٩ | ٢٦٠ | ١٣٧ | ١٥٠١ |
| ٨ | ابراهيم | ٥٩٤ | ٤٥٢ | | ١٦٠ | ١١٠٦ |
| ٩ | الحجر | ٥٠٣ | ٣٢٣ | | ٩٩ | ٩٢٥ |
| ١٠ | الشعراء | | | ٤٨٩ | | ٤٨٩ |
| ١١ | القصص | | | ٤٦١ | | ٤٦١ |
| ١٢ | العنكبوت | ٧٨٤ | ٥٥٤ | ٣٤٧ | | ١٦٨٥ |
| ١٣ | الروم | ٥٤٥ | ٣٩٦ | ٣١٨ | | ١٢٥٩ |
| ١٤ | لقمان | ٣٤٨ | ٢٩٨ | ١٧٧ | | ٨٢٣ |
| ١٥ | السجدة | ٢٦٨ | ١٥٤ | ١٥٨ | | ٥٨٠ |
| ١٦ | غافر | | | ٣٨٩ | | ٣٨٩ |
| ١٧ | فصلت | | | ٢٧٦ | | ٢٧٦ |
| ١٨ | الشورى | | | ٣٠٨ | | ٣٠٨ |
| ١٩ | الزخرف | | | ٣١٧ | | ٣١٧ |
| ٢٠ | الدخان | | | ١٤٥ | | ١٤٥ |
| ٢١ | الجاثية | | | ٢٠٠ | | ٢٠٠ |
| ٢٢ | الاحقاف | | | ٢٢٧ | | ٢٢٧ |
| | | ١٧٤٩٩ | ١١٧٨٠ | ٨٦٨٣ | ١٢٣٥ | ٣٩١٩٧ |

کەوابێ ، سەرجەمی دووبارە بوونەوەی ئەم (٤) پیتە ، لـــــەم سورەتانەی کە بوونەتە پیتی ئایەتە پیتیان دەکان ( ٣٩١٩٧) دابەشی ســەر ژمارەی (١٩) دەبێت بەبێ مانەوەی هیچ کەرتێك :ـ

٣٩١٩٧ ÷ ١٩ = ٢٠٦٣

★ ★ ★

تابلۆی (٣١) :ـ پیتەکانی ( أ ل م ص ) ، ئەم (٤) پیتە بـــــەم شێوەیەی خوارەوە دووبارە بۆتەوە لەو سورەتانەی کە ئەم (٤) پیتە بووە بە ئایەتە پیتیان :ـ

| ز | سورەتەکان | ژمارەی دووبارە بوونەوەی پیتی أ | ل | م | ص | سەرجەمەکانیان |
|---|---|---|---|---|---|---|
| ١ | البقرة | ٤٥٩٢ | ٣٢٠٤ | ٢١٩٥ | | ٩٩٩١ |
| ٢ | آل‌عمران | ٢٥٧٨ | ١٨٨٥ | ١٢٥١ | | ٥٧١٤ |
| ٣ | الاعراف | ٢٥٧٢ | ١٥٢٣ | ١١٦٥ | ٩٨ | ٥٣٥٨ |
| ٤ | يونس | ١٣٥٣ | ٩١٢ | | | ٢٢٦٥ |
| ٥ | هـود | ١٤٠٢ | ٧٨٨ | | | ٢١٩٠ |
| ٦ | يوسف | ١٣٣٥ | ٨١٢ | | | ٢١٤٧ |
| ٧ | الرعد | ٦٢٥ | ٤٧٩ | ٢٦٠ | | ١٣٦٤ |
| ٨ | ابراهيم | ٥٩٤ | ٤٥٢ | | | ١٠٤٦ |
| ٩ | الحجر | ٥٠٣ | ٣٢٣ | | | ٨٢٦ |
| ١٠ | مريم | | | | ٢٦ | ٢٦ |
| ١١ | الشعراء | | | ٤٨٩ | | ٤٨٩ |
| ١٢ | القصص | | | ٤٦١ | | ٤٦١ |

| ١٣ | العنكبوت | ٧٨٤ | ٥٥٤ | ٣٤٧ | | ١٦٨٥ |
|---|---|---|---|---|---|---|
| ١٤ | الروم | ٥٤٥ | ٣٩٦ | ٣١٨ | | ١٢٥٩ |
| ١٥ | لقمان | ٣٤٨ | ٢٩٨ | ١٧٧ | | ٨٢٣ |
| ١٦ | السجدة | ٢٦٨ | ١٥٤ | ١٥٨ | | ٥٨٠ |
| ١٧ | ص | | | | ٢٨ | ٢٨ |
| ١٨ | غافر | | | ٣٨٩ | | ٣٨٩ |
| ١٩ | فصلت | | | ٢٧٦ | | ٢٧٦ |
| ٠٢ | الشورى | | | ٣٠٨ | | ٣٠٨ |
| ٢١ | الزخرف | | | ٣١٧ | | ٣١٧ |
| ٢٢ | الدخان | | | ١٤٥ | | ١٤٥ |
| ٢٣ | الجاثية | | | ٢٠٠ | | ٢٠٠ |
| ٢٤ | الاحقاف | | | ٢٢٧ | | ٢٢٧ |
| | | ١٧٤٩٩ | ١١٧٨٠ | ٨٦٨٣ | ١٥٢ | ٣٨١١٤ |

کەوابێ ، ســەرجەمی ئــەم (٤) پیتــە لەو ســورەتانەی کــە پیتی ( أ ، ل ، م ، ص ) لە ئایەتــە پیتیانــە دەکــات (٣٨١١٤) پیت ، وە ژمارەی (٣٨١١٤) دابەشی سەر ژمارەی (١٩) دەبێت بــەبێ مانــەوەی هیچ کەرتێك :ـ

٣٨١١٤ ÷ ١٩ = ٢٠٠٦

★ ★ ★

ئیتر بەم شێوەیەی کە خستمانە بەرچاو ، ئاشکرا بوو ، کە چۆن ، پیتەکانی ئایەتە پیتەکان ئەگەر کۆ بکرێتەوە لەو ســورەتانەی کە ئایەتــە پیتیان هەیە ئەوا بەبێ مانەوەی هیچ کەرتێك دابەشی سەر ژمارەی (١٩)

دەبێت ، بەو شێوەیەی کە لەبەر چاوە ، ژمارەی (١٩) سەرچۆپی لەگەڵ هەموو پیتەکاندا گرتووە بۆ دروست کردنی ئەم جیهانە پڕ لە سنوورە، ژمارەی (١٩) توانیویەتی کەوا لەگەڵ هەر(١٤) پیتدا کە لەهەر (٣٠) ئایەتە پیت دایە خۆی رێك بخات •

★ ★ ★

خوشكو برا موسوڵمانەکانم ، ژمارەی (١٩) باڵی درێژ کردۆتەوە بەسەر چەند لایەنێکی تر لە قورئانی پیرۆزدا کە مایەی شانازی موسوڵمانانە هەتا هەتایە ، ئیتر بفەرموون لەگەڵ تابلۆ بێ وێنەکاندا •

★ ★ ★

تابلۆی (٣٢) :ــ ژمارەی سورەتەکان ، ئەگەر سەیری ژمارەی سورەتەکانی قورئانی پیرۆز بکەین دەبینین (١١٤) سورەتە ، وە ژمارەی (١١٤) دابەشی سەر ژمارەی (١٩) دەبێت بەبێ مانەوەی هیچ کەرتێك :ــ

ژمارەی سورەتەکان = ١١٤ ÷ ١٩ = ٦

★ ★ ★

تابلۆی (٣٣) :ــ ژمارەی ئایەتی (بسم الله الرحمن الرحیم) ، راستە ژمارەی سورەتەکان (١١٤) سورەتە ، بەڵام تەنیا لە پێش (١١٣) سورەتدا ئایەتی (بسم الله الرحمن الرحیم) هەیە ، چونکە سورەتی (التوبة) بەبێ ئایەتی (بسم الله الرحمن الرحیم) دەست پێدەکات ، وە ژمارەی (١١٣) دابەشی سەر ژمارەی (١٩) نابێت بەبێ مانەوەی کەرت ، بەڵام ئەو جیهانەی کە خوای گەورە دروستی بکات دوورە ، دوورە لە کەمو کورتی ، بۆیە ئەگەر سەیر بکەین دەبینین لە سورەتی (النمل) دا لە ئایەتی (٣١) دا ، خوای گەورە دەفەرمووێت (انه من سلیمان وانه

بسم الله الرحمن الرحيم) ، ئەم ئایەتە کە (بسم الله الرحمن الرحيم)(٢٧) ی تێدایە ، ژمارەی ئایەتی ( بسم الله الرحمن الرحيم ) ی لـە قـورئانی پیرۆزدا کرد بە (١١٤) ئایەت ، وە ژمارەی (١١٤) بەبێ مانەوەی هیچ کەرتێك دا بەشی سەر ژمارەی (١٩) دەبێت :ـ

١١٤ ÷ ١٩ = ٦



بەڵێ ژمارەی (١٩) بوو کە ئاشکرای کرد هۆی چیە لە سەرەتای سورەتی (التوبة) دا ئایەتە (بسم الله الرحمن الرحيم) نیە ، هەر چەند زۆربەی زاناکانی موسوڵمانان دەفەرموون ، کە سورەتی (التوبە) زۆربەی ئایەتەکانی باسی (جیهاد) دەکات ، بۆیە ، بە ئایەتی (بسم الله الرحمن الرحيم ) دەست پێ ناکات ، بەڵام ژمارەی (١٩) ئاشـکرای کـرد ئـەم پێناسەیە بۆ ئەم باسە دوورە ، خوای گەورە ، بۆ هەموو کارێك یاسـاو سنووری دیاری کراوی داناوە (وکل شي عنده بمقدار) واتە ( هەمـوو شتێك لەلای ئەوە بە رێژەیەکی دیاری کراو دانراوە ) !!

بەڵێ ئا بەم شێوەیە ئاشکرا بوو ، ئەگەر خوای گەورە لە سورەتی (التوبة) دا ئایەتی (بسم الله الرحمن الرحـیـم) هێنابا ، ئـەوا ژمـارەی ئایەتی (بسم الله الرحمن الرحيم) لە قورئانی پیرۆزدا دەبوو بە (١١٥) ئایەتی (بسم الله الرحمن الرحيم) ، وە ژمارەی (١١٥) دابەشی سـەر

---

(٢٧) ئەم ئایەتە سەرەتای ئەم نامەیە بوو کە سلیمانی پێغەمبەرمان (ص) بۆ (بەلقیسی) نارد •

ژمارەی (١٩) نابێت بەبێ کەرت ، بۆیە لە سورەتی (التوبة) دا ئایەتی (بسم الله الرحمن الرحیم ) نەهاتووە ! !

وە ئەمە لەبارەی نەهاتنی ئایەتی (بسم الله الرحمن الرحیم) ە ، بەڵام ئەگەر دەپرسن ئایا بۆچی لە سورەتی (التوبة) دا ئایەتی (بسم الله الرحمن الرحیم) نەهاتووەو لە سورەتەکانی تردا هاتووە ؟! یا بە شێوەیەکی تر ، بۆچی ئایەتی (بسم الله الرحمن الرحیم) لە سورەتی (التوبة) دا لابراوە لە سورەتێکی تردا لانەبراوە ؟ !

دەستی کورتی زانست تائێستا پەنجەی بۆ ئەم وەڵامە درێژ نەکردووەو چاوی میکرۆسکوبو بیری تەسکی ئامێری ئەلەکترونی نەگەیشتۆتە ئەم ئاستە کە تێی بگەن !

بەڵام چاوەنوارین ، چاوە نواڕین کە بە ماوەیەکی کەم زانیاری پەردە لەسەر ئەم لایەنەش لابدات !

لەم (٤) تابلۆیەی کە دادێت سەیری ووشەکانی ئایەتی (بسم الله الرحمن الرحیم) دەکەین کە جۆت بەشداریان لەگەڵ پاڵەوانی باسەکەمان کردوە ( واتە ژمارە ــ ١٩ ) !

★ ★ ★

تابلۆی (٣٤) :ــ لەم تابلۆیەدا سەیری ژمارەی دووبارە بوونەوەی ووشەی ( بسم ) و ووشەی ( اسم ) دەکەین •

ووشەی ( اسم ) ، ئەم ووشەیە لە قورئانی پیرۆزدا لە (١٩) جێگادا هاتووە ، وە ژمارەی (١٩) بەبێ مانەوەی هیچ کەرتێك دابەشی سەر ژمارەی (١٩) دەبێت •

ووشەی (اسم) لە قورئانی پیرۆزدا =

١٩ ÷ ١٩ = ١

وە ووشەی (بسم) کە (٣) جار دووبارە بۆتەوە لە ژمارەی ووشەی (اسم) بەدەین کە (١٩) جار دووبارە بۆتـەوە ، دەبینین دەکـات (٥٧) (٣ × ١٩ = ٥٧) وە ژمارەی (٥٧) دابەشی سەر ژمارەی (١٩) دەبێت بەبێ مانەوەی هیچ کەرتێك :ـ

٥٧ ÷ ١٩ = ٣

★ ★ ★

تابلۆی (٣٥) :ـ ووشـەی (الله) ، ووشـەی (الله) لە قـورئانی پیرۆزدا بەم شێوەیە دووبارە بۆتەوە :ـ

ووشەی (الله) بەشێوەی (الرفع) (٩٨٠) جار هاتـووە لە قورئانی پیرۆزدا (٢٨) •

ووشەی (الله) بە شێوەی (النصب) (٥٩٢) جار هاتووە لە قورئانی پیرۆزدا •

ووشەی (الله) بەشێوەی (الجر) (١١٢٦) جار هاتـووە لە قورئانی پیرۆزدا •

کەواتە ٩٨٠ + ٥٩٢ + ١١٢٦ = ٢٦٩٨ ووشەی (الله) هاتووە •

---

٣٨ـ لە نامیلکەی ( علیها تسعة عشر ـ کـە دکـتۆر رەشـاد خەلیفـە نووسیویەتی ) لە ـ ل ـ ٤١ ـ دا ، ووشەی (الله) بەشێوەی (الرفع) (٨٩٠) جاری نووسیوە ، ئەمە هەڵەیە بەڵکو (٩٨٠) جار ووشەی (الله) بە (الرفع) هاتووە لە قورئانی پیرۆزدا ، بروانە (المعجم المفهرس ـ محمد فؤاد ـ ل ـ ٤٠ ) !

وه ژمارەی (٢٦٩٨) دابەشی سەر ژمارەی (١٩) دەبێت بەبێ مانەوەی هیچ کەرتێك :ـ

ووشەی (الله) لە قورئانی پیرۆزدا = ٢٦٩٨ ÷ ١٩ = ١٤٢ (٢٩)

★ ★ ★

نابلۆی (٣٦) :ـ ووشەی ( الرحمن ) ، ئەم ووشەیە لە قورئانی پیرۆزدا (٥٧) دووبارە بۆتەوە وە ژمارەی (٥٧) دابەشی سەر ژمارەی (١٩) دەبێت بەبێ مانەوەی هیچ کەرتێك :ـ

٥٧ ÷ ١٩ = ٣

★ ★ ★

تابلۆی (٣٧) :ـ ووشەی (الرحیم) ، ئەم ووشەیە لە قورئانی پیرۆزدا لە (١١٥) جێگادا هاتووە ، وە ئەگەر ژمارەی (١١٥) دابەشی سەر ژمارەی (١٩) بکەین ، دەبینین بەبێ مانەوەی کەرت دابەش نابێتە سەری ، بەلام « د • رەشاد خەلیفة » دەڵێت :ـ

---

٢٩ـ لە ـ المعجم المفهرس ـ محمد فؤاد ـ ل ـ ٤٠ ـ دا تاکو ـ ل ٧٥ ووشەی (الله) (٢٦٩٧) جار نووسراوە ، بەڵام (١) جار نەنووسراوە ووشەی (الله) کە بە شێوەی (الجر) هاتووە لە ئایەتی ( بسم الله الرحمن الرحیم ) لە سورەتی ( الفاتحة )دا ، واتە ووشەی (الله) (٢٦٩٨) جار لە قورئانی پیرۆزدا هاتووە !
چونکە ( بسم الله الرحمن الرحیم ) لە سورەتی ( الفاتحة )دا ئایەتە ! بڕوانە ( علیها تسعة عشر ـ د• رەشاد خەلیفە ـ ل ـ ٤١) کە مامۆستا ( صدقی بیك ) بە ووردی ئەم راستییەی ئاشکرا کردووە •

ڕاستە (١١٥) جار ووشەی (الرحیم) لە قورئانی پیرۆزدا هاتووە ، بەلام (١١٤) جاریان (سیفەتی) خوای گەورەن‌و بەس ، وە جاری (١١٥) مین کە لە سورەتی (التوبة)دا هاتووە لە ئایەتی (١٢٨) « وبالمؤمنین رؤوف رحیم» ئەوا پەیوەندی لەگەڵ پێغەمبەرەوە هەیە (ص)و بەس ، لێرەدا ووشەی (الرحیم) بە واتای ( سیفەتی ) خوای گەورە نەهاتووە •

کەواتە :ـ (١١٤) جاریان بە (سیفەتی) خوای گـەورە هاتـووە وە ژمارەی (١١٤) دابەشی سەر ژمارەی (١٩) دەبێت بەبێ مانەوەی هیـــچ کەرتێك :ـ

١١٤ ÷ ١٩ = ٦

★ ★ ★

لە قورئانی پیرۆزدا ، کۆمەڵەیەکی زۆر ژمارە هاتووە ، ئەگەر بە ووردی سەیری ئـەم ژمارانە بکەیـن ، دەبینین دووره پەرێزنین لـەو کۆدەتایەی کە ژمارەی (١٩) گێڕای ، بەڵێ ژمارەکانی قورئانی پیرۆز (٣) تابڵۆی زۆر قەشەنگیان لەگەل ژمارەی (١٩) دا پێك هێناوە ، کـە بەلای منەوە ، ئەم (٣) تابڵۆیە زۆر زۆر ووردترە لە تابڵۆکانی ئایەتـە پیتەکان •

دوو دڵ نیم لەوەی ئەو خوایە گەورەیەی کە ئەم ژمارانەی لەناو قورئانی پیرۆزدا داناوە ، وەك بەم شێوەیەی دابەشی سەر ژمارەی (١٩) دەبن ، زۆر زۆر باش ئاگاداری ئەم هەموو دابەشەیە ، چونکە ئەم (٣) تابڵۆیە زۆر بە چاکی ئەم ڕاستی‌یەیان ئاشکرا کرد • بفەرموون لەگەل تابڵۆکان دا :ـ

★ ★ ★

تابلۆی (٣٨) :ـ ئەگەر ئەو ژمارانەی کە لە قورئانی پیرۆزدا هاتوون کۆیان بکەینەوە ، بەلام بەمەرجێك ئەگەر چەند جاریش دووبارە بوبێتەوە، ئەوا هەموو جارەکان دەکاتە :ـ

| ز | ئایەنەکە | ژمارەکە | ئایەت | سورەت |
|---|---|---|---|---|
| ١ | قل هو الله احد | ١ | ١ | الاخلاص ★ |
| ٢ | اله واحد | ١ | ١٦٤ | البقرة |
| ٣ | اثنتا عشر عينا | ١٢ | ٦٠ | البقرة |
| ٤ | سبع سموات | ٧ | ٣٠ | البقرة |
| ٥ | من احـد | ١ | ١٠٣ | البقرة |
| ٦ | من احـد | ١ | ١٠٣ | البقرة |

★ وردە تێبینیەکانی ئەم خشتەیە :ـ

أ : ـ ئەگەر ژمارەی (احد) یا (مائة) یا ••• هتد ، (١٠) جـار یا چەندان جار دووبارە بۆوە ئەوا هەموو جارەکان کـۆ دەکەینەوە •

ب : ـ بۆیە دەڵێین (٢٨٥) لە بەشی زنجیرە ، چونکە (٢٨٥) جار ژمارە لە قورئانی پیرۆزدا هاتووە •

جـ : ـ کە دەڵێین ( ١٧٤٥٩١) لە کۆتایی ژمارەکان ، چونـکە کۆی هەموو ژمارەکانی قورئانی پیرۆز بە دووبارە کانیشەوە دەکات ( ١٧٤٥٩١) •

د : ـ ئێمە لەبەر درێژ نەبوونی مادەکە هەر (٢٨٥) ژمارەمان نـە نووسی ، ئەگەر هەر (٢٨٥) ژمارەمان دیار خستبایە ئەوا (٢٠) لاپەرەی دەگرت ، بمان بوورن !

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| ٧ | أحدهم لو يعمر | ١ | ٩٦ | البقرة |
| ٨ | الف سنة | ١٠٠٠ | ٩٦ | البقرة |
| ٩ | الها واحدا | ١ | ١٣٣ | البقرة |
| ١٠ | بل مائة عام | ١٠٠ | ٢٦٠ | البقرة |
| ١١ | بين احد | ١ | ٢٨٥ | البقرة |
| ١٢ | تسع وتسعون نعجة | ٩٩ | ٢٤ | ص |
| ١٣ | نعجة واحدة | ١ | ٢٤ | ص |
| ١٤ | بثلثة الاف من الملائكة | ٣٠٠٠ | ١٢٤ | أل عمران |
| ١٥ | في تسع ايات | ٩ | ١٢ | النمل |
| ١٦ | عشرون صابرون | ٢٠ | ٦٦ | الانفال |
| ١٧ | يغلبوا مائتين | ٢٠٠ | ٦٦ | الانفال |
| ١٨ | منكم مائة | ١٠٠ | ٦٦ | الانفال |
| ١٩ | يغلبوا الفا | ١٠٠٠ | ٦٦ | الانفال |
| ٢٠ | مائة صابرة | ١٠٠ | ٦٧ | الانفال |
| ٢١ | يغلبوا مائتين | ٢٠٠ | ٦٧ | الانفال |
| ٢٢ | منكم الف | ١٠٠٠ | ٦٧ | الانفال |
| ٢٣ | يغلبوا الفين | ٢٠٠٠ | ٦٧ | الانفال |
| ٢٤ | مائة الف | ١٠٠٠٠٠ | ١٤٨ | الصافات |
| ٢٥ | ثلثـــة | ٣ | ٢٤ | الكهف |
| ٢٦ | رابعـــم | ٤ | ٢٤ | الكهف |
| ٢٧ | خمسة | ٥ | ٢٤ | الكهف |
| ٢٨ | سادسهم ... | ٦ | ٢٤ | الكهف . . . |
| ٢٨٥ | . . . . | ١٧٤٥٩١ ... | | |

بەڵـێ دەبینین کۆی هەموو ژمارەکانـی قورئانـی پـیرۆز دەکـات (١٧٤٥٩١) ، وە ئەم ژمارەیەش دابەشی سەر ژمارەی (١٩) دەبێت بەبێ مانەوەی هیچ کەرتێك :ـ

٩١٨٩ = ١٩ ÷ ١٧٤٥٩١

★ ★ ★

تابلۆی (٣٩) :ـ ئێمە لە تابلۆی (٣٨)دا گووتمان کۆی هەموو ژمارەکان کە لە قورئانی پیرۆزدا هاتووە وە بە هەموو دووبارە بوونەوەکانیشی دەکاتە (١٧٤٥٩١) وە ئەم ژمارەیەش دابەشی سەر (١٩) بوو بەبێ مانەوەی هیچ کەرتێك ، بەڵام لەم تابلۆیەدا پێتانی رادەگەیەنین، ئەگەر هەموو ژمارەکانی کە لەناو ئایەتەکانی قورئانی پیرۆزدا هاتوون کۆی بکەینەوە ، بەمەرجێك ئەو ژمارانەی کە چەند جار دووبارە بوونەتەوە تەنیا (١) جاریان بژمێرین، دەبینین دەکاتە (١٦٢١٤٦) •

یا بەشێوەیەکی تر ، ئەگەر ژمارەکانی کە لە ئایەتەکانی قورئانـــی پیرۆزدا هاتوون کۆیان بکەینەوە ، بەلام بە مەرجێك ئەگەر ژمارەی (احد) یا (مائة) یا (الف) یا ••• یا ••• هتد ، چەندان جار هاتبوو ئەوا هەر یەك جاریان وەربگرینو کۆی بکەینەوە دەکات (١٦٢١٤٦) ، وە ئـــەم ژمارەیەش دابەشی سەر ژمارەی (١٩) دەبێـت بەبـێ مانەوەی هیـــچ کەرتێـك : ـ

٨٥٣٤ = ١٩ ÷ ١٦٢١٤٦

★ ★ ★

تابلۆی (٤٠) :ـ ئەگەر ژمارەی هاتنی ژمارەکان لە قورئانی پیرۆزدا کۆ بکەینەوە ، واتە بزانین چەند جار ژمارە لە قورئانی پیرۆزدا هاتووە ،

دەبینین ژمارەی هاتنی ژمارەکان لە قورئانی پیرۆزدا دەکات (٢٨٥) ، واتە (٢٨٥) جار ژمارە لە قورئانی پیرۆزدا هاتووە ، وە ژمارەی (٢٨٥) دابەشی سەر ژمارەی (١٩) دەبێت بەبێ مانەوەی هیچ کەرتێك :ـ

١٥ = ١٩ ÷ ٢٨٥

★ ★ ★

ئەو (٣) تابلۆیەی کۆتایی پیشانگای یەکەم ، فێری چەند لایەنێکی تری کردین ، کە بریتی‌یە لەوەی قورئانی پیرۆز زۆر بە ووردی ئاگاداری ئەم تابلۆیانەیە ، بۆبەڵگە :ـ

ئەگەر سەیری ئایەتی ( ١٤ ـ العنكبوت ) بکەین :ـ فلبث فيهم ألف سنة الا خمسين عاما ... ) ، لەگــەل ئایەتـی ( ١٩٦ ـ البقرة ) :ـ (فصيام ثلثة أيام في الحج‌و سبعة اذا رجعتم تلك عشرة كاملة ...» (٣٠).

لە ئایەتی (١٤ ـ العنكبوت)دا دەبینین (٢) جار ژمارە هاتووە (١٠٠٠) وە (٥٠) ، باشە بۆچی یەکسەر قورئانی پیرۆز نافەرمووێت (٩٥٠) ساڵ ؟! دەفەرمووێت (١٠٠٠) ساڵ (٥٠) ساڵ کەمتر ! ، ئەگەر بێت‌و (١٠٠٠) ژمارەی (٥٠)ی لێ دەربکەین هەر ناکات (٩٥٠) ؟ ! !

ئەمە لەلایەك ، وە لەئایەتی (١٩٦ ـ البقرة ) دا دەبینین (٣) جار ژمارەە هاتووە (٣ ، ٧ ، ١٠) ، ئایا بۆچی لێرەدا ژمارەی (١٠) هاتووە؟، خۆ ئەگەر خوای گەورە بیفەرمووبا ( فصيام ثلثة أيام في الحج وسبعـة

---

٣٠ـ ئەو ژمارانەی کە لەم (٢) ئایەتەدا هاتوون ، لەو ژمارانەن کــــە گووتمان (٢٨٥) جار ژمارە دووبارە بۆتەوە ، بۆ ئاگاداری !

اذا رجعتم ٠٠٠) بەس بوو (نعوذ بالله ) بۆ ئەوەی یەکێکی (بالغ) (٣١ – ٣٢) تێی بگات کە دەکاتە (١٠) !

لێرەدا ، ئاشکراتر بوو ، کەوا چۆن ، خوای گەورە ، ئـــەم تابلۆیانەی داناوەو ئاشکرابوو کە چۆن ئەم تابلۆیانە نموونەی دەسەلاتی بێ سنووری خوای گەورەن !

ئەگەر خوای گەورە بیفەرمووبا (٩٥٠) ساڵو بەس ، نەیفەرمووبا (١٠٠٠) (٥٠)ی لێ بـڕوات ، ئـــەوا هـەر (٣) تابلۆکـەی کۆتـایـی (ئۆلمپیاکەمان) نەدەما !!

بۆچی ؟ ، لەبەر ئەوەی :–

١ – ژمارەیەك لە ژمارەکانی هاتنی ژمارە لە قورئانی پیرۆزدا کەم دەبۆوە ، واتە (٢٨٥) لە تابلۆی (٤٠)دا دەبوو بە (٢٨٤) ، ئەوسا دابەشی سەر ژمارەی (١٩) نەدەبوو بەبێ کەرت !

٢– ژمارەی (١٠٠٠) لەگەل ژمارەی (٥٠) کە لە ئایەتی (١٤ – العنكبوت )دا هاتووە ، ئەگەر کۆیان بکەینەوە دەکاتە (١٠٥٠) ، بەلام ئەگەر یەکسەر ، قورئانی پیرۆز بیفەرمووبا (٩٥٠) ئەوا (١٠٠) دانـە لە تابلۆی (٣٨)دا کەم دەبۆوە ، واتە ( ١٧٤٥٩١) دەبوو بە (١٧٤٤٩١)،

---

٣١– بۆیە دەڵێین (بالغ) چونکە (بالغ)بوون مەرجێکە لە مەرجەکانـــی چوونە (حـــەج) ، وە ئادەمـــیزادی ( بالغیش ) دەزانێت (٣) کـــۆ (٧) دەکاتە (١٠) ! !

٣٢– نموونەمان لەم بارەوە لە قورئانی پیرۆزدا زۆرە بەلام ئەم (٢) ئایەتە بەسە لەم گۆشەیەدا !

ئەوکاتە دابەشی سەر ژمارەی (١٩) نەدەبوو بەبێ کەرت !

چونکە خوای گەورە ، دەفەرموێت (١٠٠٠) ساڵ (٥٠) ساڵی لـێ بروات وە (١٠٠٠ + ٥٠) = ١٠٥٠ ، وە ژمارەی (١٠٥٠) یەکێـکە لە (١٧٤٥٩١) !

★ ★ ★

وە ئەگەر سەیری ئایەتی (١٩٦ ــ البقرة) بکەین بە هەمان شێوەیە، چونکە ئەگەر خوای گەورە بیفەرمووبا (٣)وە (٧) (فصیام ثلثة ایام في الحج وسبعة اذا رجعتم ..) وبەس بەبێ هاتنی ژمارەی (١٠) ، ئـــەوا تابلۆی (٤٠) نەدەما ، چونکە (٢٨٥) دەبوو بە (٢٨٤) !

وە تابلۆی (٣٨) نەدەما ، چونکە (١٠) ژمارە کەمتر دەبۆوە لـە (١٧٤٥٩١) دەبوو بە (١٧٤٥٨١) !

واتە تابلۆکانی (٤٠ ، ٣٨) دابەشی سەر ژمارەی (١٩) نەدەبوون (ئەوکاتە) بەبێ کەرت .

★ ★ ★

بەڵێ ، بەم شێوەیەی روونمان کردەوە ئاشکرا بوو کە ئەو ژمارانەی لەناو قورئانی پیرۆزن بە شێوەیەکی وا کارەبایی زۆر ناسك دانراون کە یاساو سنووری دیاری کراویان هەیە ، وە ئەم جۆرە یاسایەش مایــەی شانازی موسوڵمانانەو بوومەلەرزەی ژێرپای بێ باوەڕانی جیهانە !

# پیشانگای یەکەم

## پەردەی شەشەم

## ئایەتە پیتەکانو بەشە دەنگەکانی پیتی زمانی عەرەبی

ئەگەر سەیری پیتەکانی ئایەتە پیتەکان بکەین ( أ ل م ر ص ق ك هـ ی ن ع ح ط س ) دەبینین بە شێوەیەکی زۆر رێكو قشتیلانە خۆیان رێك خستووە لەگەڵ ئەو بەشانەی کە زاناکان بۆ دەنگە پیتەکانی زمانی عەرەبی‌یان داناوە •

وا بەم بۆنەیەوە ، کە پیشانگاکەمان تایبەتی‌یە لەسەر ئایەتە پیتەکان ، چۆنیەتی پەیوەندی نێوان پیتەکانی ئایەتە پیتەکانو بەشە دەنگەکانی پیتی زمانی عەرەبی دەخەینە بەرچاو ، بەو ئاواتەی سودبەخش بێت •

★ ★ ★

١ـ زانا زمانەوانی زانەکان دەنگەکانی پیتی زمانی عەرەبی‌یان کردوە بە (٢) بەش (المهموسة ، المجهورة ) •

پیتەکانی (المجهورة) (١٨) پیتن :ـ

( أ ل م ر ی ع ط ق ن ب ج ض ظ غ د ذ ز و ) •

ئەگەر سەیری ئەم (١٨) پیتە بکەین ، دەبینین (٩) پیتیان لەپیتەکانی ئایەتە پیتەکانە ( أ ل م ر ی ع ط ق ن ) •

واتە نیوەی پیتەکانی (المجهورة) پیتی ئایەتە پیتەکانە •

وە پیتەکانی (المهموسة) (١٠) پیتن :ــ ( ت ث ح خ س ش ص ف ك هـ ) •

بەڵێ نیوەی پیتەکانی (المهموسة)ش پیتی ئایەتە پیتەکانە :ــ ( ح ص س ك هـ ) •

کەواتە پیتەکانی ئایەتە پیتەکان بەشداریان لەگەڵ پیتەکانی (المجهورة) وە (المهموسة) کردوە بە راژەی ($\frac{1}{2}$) •

★ ★ ★

٢ ــ کۆمەڵێکی تر لە زاناکان دەنگە پیتەکانی زمانی عەرەبی‌یان کردووە بە (٢) بەشی تر ( الشدیدة ، الرخوة ) •

پیتەکانی (الشدیدة) (٨) پیتن :ــ

( ا ب ت ج د ط ق ك ) وە نیوەی ئەم (٨) پیتە لە پیتەکانی ئایەتە پیتەکانن ( أ ط ق ك ) •

وە پیتەکانی ( الرخوة) (٢٠) پیتن :ــ ( ل م ص ر هـ ی ع س ح ن ض ظ ف ذ و ز ث ش خ غ ) • (١٠) پیت لەم (٢٠) پیتەدا، لە پیتەکانی ئایەتە پیتەکانن :ــ

( ل م ص ر هـ ی ح ع س ن ) •

